خوێندنەوەیەکی نوێ بۆ مێژووی کورد

﴿٣﴾



به نوێنەری کورد دەگاتە حیجاز

حسن محمود حمه کریم

١٩٩٧ زایینی - ١٤١٨ کۆچی

# بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

## پێشەکی :

جێی فەخرو شانازیە بۆ گەلی کورد، کە شەرەفی بەشداری سەرەتای بانگەوازی ( محمد )یان بوو بە نسیب.. سەربەرزیە بۆ میللەتی کورد، کە هەر لە ( قۆناغی نهێنی ) مەککەوە، لە شاخەکانی کوردستانەوە نوێنەریان گەیاندوەتە بیابانەکانی حیجاز، هەتا ڕاست و دروستی ئەو پێغەمبەرە نوێیەی بۆ دەرکەوێ کە ( ئاویستا ) مژدەی پێ‌داوە..

بەڵێ.. کوردی بە ئەمەگ و هەق پەرست دوا نەکەوت.. بەڵکو دەتوانم بڵێم لە پێش ( سەلمانی فارسی ) و ( صهیبی ڕۆمی ) و ( بلالی حەبەشی ) و ( عەداسی نەینەوایی ) و ( نوێنەرەکانی نەجران ) ەوە خۆیان گەیاندوەتە مەککەو بە دیداری ( محمد ) و( ئاینی نوێ ) شاد بوون.

ئەگەر ئەوان هەریەکە مەبەستێک گەیاندونیەتە حیجاز، کورد ڕاست و دروست لەبەر خوا بووە.

ئەو کاتەی کە بیلالی حەبەشی لە دەشتێکی کراوەدا بەردی گەرم دەنرایە سەر پشتی و لاشەیان پێ داخ دەکرد، ( ابو بصیر) مەیمونی کوڕی جابانی کوردی لە کونجوڕی بەندیخانەکانی مەککەدا توند کرابوو، بۆ هەلێک دەگەڕا خۆی دەرباز بکات..

کورد بەشداری قۆناغی نهێنی بانگەوازی ئیسلامی کرد لەشاری مەککەدا.. کۆسپ و تەگەرەو تاڵ و ترشی سەرەتای بانگەوازی چەشت.. دەستی لە بناغە دانانی دوا ئاینی خوادا بووە، هەر ئەو نوێنەرایەتیە بوو، کارێکی وای کرد، کورد پێش هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان موسوڵمان بێ‌و لایەنی خۆی دیاری بکات، بەبێ هیچ شەڕو کوشتارێکی وا، شایانی باس کردن بێت، کوردستان لەژێر چەپۆکی فارس و ڕۆم پاک کرایەوە..ئەمەیە جیاوازی نێوان کوردو گەلانی دونیا بەرامبەر ئیسلام.. ئەگەر میللەتانی تر بە زۆر بوبێ یان بە ڕێک کەوتن و خۆشی ئاینیان بۆ برابێ.. کورد بە پێچەوانەی هەموو میللەتانی ترەوە، خۆی چوەتە حیجازو پێغەمبەری بینیوەو ئاینی لێ وەرگرتوەو بەئەمانەت بۆ گەلی خۆی هێناوەتەوە.

# بارودۆخی جیهان پێش ئیسلام

هەرکاتێ ژیان تێک چوبێ‌و، لەدەست دەرچوبێ و هیچ چارێک بۆ خەڵکی نەمابێ ، بە خۆیان و هیچ موصلحیك تیمار نەکرابێ، پێویستیان بە ڕزگارکەرو دەستێکی پەنهانی بووبێ بگاتە فریایان.. ئەوسا خوای گەورە،داناو حەکیم و ڕزگارکەرو پێغەمبەرێکی بۆ ناردون لە خۆیان و بە زمانی خۆیان..

پێش ئەوەی ئیسلام بێت.. بارودۆخی سەر زەوی ئاڵۆزاو بوو، شیرازەی هەموو شتێک پچڕابوو، مرۆڤایەتی بەرەو لێواری لەناوچوون دەچوو.. بۆ نمونە:

تەنها لەهیندستان ( ٣٣٠ ) ملیۆن بت دەپەرسترا.[1] لەنیوە دورگەی عەرەبدا، هەمووماڵێک بتی تایبەتی هەبوو. ( ٣٦٠ ) بت لەناو کەعبەدا دانرابو، ( مەی ) و (سوو ) کۆڵەکەو بناغەی ئابوری بوو، (قومار) کاری پیاو ماقولان بوو ( زیندە بەچاڵ ) کردنی کچ بە شانازیەوە باس دەکرا..[2] ئاینی گاورو جولەکە دەسکاری کرابوو، نەگیانیان تیا مابوو نە وێنەو نیگار، ( پۆلس ) خەرافات و بت پەرستی بۆ ئاینی گاور هێنا.. ( قسطنطین) گۆشەگیری کردوو لە کۆمەڵگای دور خستەوە.. جیاوازی و دوبەرەکی کەوتە ناو گاورەکان، چەند شەڕی خوێناویان لەناودا قەوما.. شۆڕش و ڕاپەڕینیان بەرپا کرد، ساڵی ( ٥٣٢ ) ی زاینی ( ٣٠ ) هەزار کەس لە ڕۆما کوژرا، خەڵکی لە حوکومەتان بێزار بوون، شەڕی گاورو جوو هەموو شامی گرتەوە،ساڵی ( ٦١٠ ) ی زاینی گاورەکانی (ئەنطاکیە) هەموو جولەکەکانیان بە ژن و منداڵەوە سەبڕی، پاشاکانی ڕۆم خۆیان بە بەشێک لە خوا دەزانی.. (ئەسکەندەری مەکدۆنی ) دەیوت مادام لە هەموو جەنگەکاندا سەردەکەوم کەواتە بەشێک لە خوایەتیم تیایە..[3] پاشاکانی فارس لایان وابوو کە خوێنی خوایەتی بەڕەگەکانیاندا هات وچۆ دەکات، گەمارۆی خوێندەواریان دابوو لە کۆشکەکان دەرنەدەچوو.. شەڕی فارس و ڕۆم ئابوری ئیمبراطوریەتی فارسی تەواو ڕوخاند.. حکومەت خواردنی سوپای بۆ دابین نەدەکرا، پاشا داوای لە (بۆزرگمهیری ) وەزیر کردکە دەوڵەمەندەکانی وڵات کۆکاتەوە، هەرکەس بتوانێ یارمەتی حکومەت بدات، چی داوا بکات بۆی دەکرێ.. بازرگانێک بەناوی (کەفشکەر) دەڵێ ( من خەرجی دووساڵی سوپا دەدەم و تەنها داخوازیەکی زۆر ساکارم هەیە.. ڕێگابدەن تاقە کوڕەکەم لە کۆشکی پاشادا لەگەڵ نەجیب زادەکان و منداڵی ( موغەکان ) زانا ئاینیەکان دەرس بخوێنن.. کە هەواڵ درا بە پادشا، دەست بەجێ داخوازیەکەی ڕەد کردەوە..[4]

ڕێبـازی ( مـــانی ): لەســەدەی ســێیەمی زایــن دا ڕێبـازی مـانی هاتــە ڕوو، پەیدابوونی ئەم لــە ئــەنجامی بێ پــەردەیی‌و شـوڵ لێهەڵکێشـانی خـەڵکی وڵاتـی فـارس بـوو، (مـانی) کەوتـە بـانگ کردنـی خـەڵکی بـۆ سـەر ژیانی سـەڵتی‌و ژن نەهێنان.. منداڵ نەبێ‌و ژیان کۆتایی بێت و ڕۆشنایی سەرکەوێ بەسـەر تاریکایی دا..[5] هەتا ســاڵی (٢٧٦) زاینـی (بـارام) پاشـای فـارس کوشـتی‌و ووتـی: ئـەم بانگکەرە دەیەوێ جیهان کۆتایی بێت، بـاش وایـە لەخۆیـەوە دەسـت پـێ بکـرێ، پێش ئەوەی هیچ ئاواتێکی بێتە دی..[6] ئەو بیرۆکە زۆر نەژیا..

**ڕێبازی مەزدەک**: لەساڵی (٤٨٧) زاینیدا (مـزدەک کـوڕی بـامراد) لـە دایـک بـوو.. خـەڵکی (فسـای) شـوانکارە بوو، لـە کـاتی گـەنجیدا کتێبـی (بونـد)ی زەردەشتی دەسکاری کرد، بە هی خۆی لە قەڵەم داو لافـی پێغەمبەرایـەتی لێدا، بیروباوەڕی هاوبەشـێتی (اشـتراکی) بـە وڵاتـدا بـڵاو کـردەوە، هـاواری دەکـرد (مرۆڤەکان وەکو یەک لە دایک بـوون، جیاوازیـان لـە نێوانـدا نـەبوە، ئـەبێ وەکو یەکیش بژین و جیاوازیان نەبێ..) دەیوت (دەبێ- ژن و مـاڵ- بۆ هـەموو کـەس یەکسان بێت و پەردە لە نێواندا نـەبێ..)[7] مـەزدەک ژن و سـامانی بـەرەڵا کـرد مرۆڤەکانی تیا هاوبەش کرد، هـەروەکو هاوبەشـی لـە ئـاوو هـەواو ئـاگرو لـەوەڕی ئاژەڵدا، ئەم ڕەوشتە لەگەڵ شان و شەوکەتی کۆشکی پاشاکانی ئـێراندا گونجـا.. (قوبادی پاشا) ی ساسانی فارسی پــێ خەڵـەتا،[8] (ئەنوشـیروان)ی کـوڕی، کـە هەر لە منداڵیەوە لەسەر ئەو ڕەوشتانە ڕقی لە باوکی بـوو بـە یارمـەتی موغـەکان شۆڕشـی کـرد، ئـەم بیرۆکەیـە لـە دینـەوەری (کوردسـتان) زۆر پـەرەی سـەند، هەموو شتیان تێکەڵاو کرد، بەڵام (ئەنوشیروان) قەڵاچۆی کردن و پتر لە (سـەد) هەزار کەسی لێ کوشتن، کە باوکیشی یـەکێک بـوو لەوانـە..[9] (ئـەدوارد بـراون) دەڵێ (کە مزدک کوژرا) ژنەکەی لەگەڵ دوو کەس لــە پـەیڕەوانی لـە (تیسـفون) هـەڵهاتن و بـەرەو (ڕەی) لــەوێ خــەڵکی زۆریـان لـەدەور کۆبویـەوە..[10] لـە ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی زاینیدا،( یـزد گـورد)ی پاشـای فـارس لەسـەر ئـەو مەزهەبـە کچی خـۆی مـارە کـرد، پاشـان کوشـتی، دوای ئـەو(بهرامـی چوپـین) لەسەدەی شەشەمدا خوشکی خۆی مارە کرد..[11]

## سەرەنجام

بارودۆخیی شڵەقاوی لەم جۆرە، پێویستی بەکەسێکی دانا و زانـا و خـاوەن ڕەوشت و خـوی بـەرز هـەبوو تیمـاری بکـات، دنیایـەکی ڕوخـاوی وا، وەسـتایەکی

شارەزای دەویست دروستی بکاتەوە.. بینیمان کە ئـەم کـەش و هـەوا ئـاڵۆزە بـە (مانی) و (مەزدەک) (قەشەو) پاشاکانی فـارس و ڕۆم چارنـاکرێت.. ئـەوەندەی تـر تێکیـان داو خەسـاریان کـرد.. هـەردوو ڕێبـازی مـانی و مـەزدەک کەبـەزەینی لاوازی خۆیان چاریان بۆ مرۆڤایەتی هێنا بوو.. چونکە بەرهەمی هەوا و هەوەس و ئارەزوو زەینی تەنهای خۆیان بوو.. دنیاکـەیان ئـاڵۆزاند.. (مـانی) دەیویسـت ژن هێنان نەمێنێ، تۆوی مرۆڤایەتی بپوکێتەوە جیهان کۆتای بێت، بـەبۆچوونی خـۆی بەم جۆرە ڕوناکی زاڵ دەبێ بەسەرتاریکایی‌دا، بـەڵام (مـەزدەک) یەکـەم : کـاری اصلاحی ئەوە بوو، کتێبێکی (زەردەشت)ی دەسکاری کرد و کردی بەهی خـۆی.. دووەم : لافی پێغەمبەرایەتی لێ‌دا.. سێیەم : بیروباوەڕی هاوبەشێتی (اشتراکی) هێنا.. داوای دەکرد کـە (ژن و سـامان) بـۆ هـەموو کـەس بێـت .. پاشـاکانی فـارس پشـتیان گـرت، کۆتـایی ئـەمیش بەشـەڕ و خوێـن ڕشـتن هـات، ئـەمیش بارودۆخەکەی ئەوەندەی تر ئاڵۆز کـرد.. کـەش و هـەوا بـەم جـۆرە کەسـانە چـار نـاکرێت، ئەگـەر خـوای گـەورە خـۆی بـە هانایانـەوە نەیـەت و، بـەری ئـەم لافـاوە نەگرێت، زۆر نزیکە مرۆڤایەتی خەساربێ و لەناوبچێت.. لە (انجیل ) و (تەورات) و (ئاوێسـتادا) مـژدەی زۆر هـەبوو، کەلـەکات و سـاتی ڕوخـاوی لـەم جـۆرەدا، پێغەمبـەرێک دێـت و ڕەوڕەوەی مێـژووی مرۆڤایـەتی دەگۆڕێـت.. کاتەکـە تـەواو گەشتبوو، زاناکانی ئەو سێ ئاینە، چاوەڕوانیان دەکرد و گوێ قوڵاغ و لە مقۆمقۆدا بوون.. بەتایبەت کوردەکان کەبەجۆرێک گیریان بەدەست شەڕ و زوڵم و زۆر و باج و پیتاکی ئەو دوو ئیمپراتۆرە فارسی و ڕۆمی‌یـەوە خواردبـوو.. هەمیشـە ئومێـدی هێزێکی سێهەم بوون کەڕزگاریان بکات.. ئەم دوو بەڵایەیان لە کۆڵ بکاتەوە..

لە (انجیل و تەورات دا) هەبوو کە ئەو پێغەمبەرە لە (وڵاتی دار خورما) وە دێـت (ذات نخل بین حرتین ) [12] کە وڵاتی عەرەب دەگرێتەوە.. لە (ئاوێستا) دا دەڵـێ (هاوڕێکانی پێغەمبەری عەرەبی) یان (خاوەنی وشـترە سورەکە دێـت لـە وڵاتـی عەرەبەوە ) [13] هەر وەک لە ئنجیل وتەوراتُ ناوی دار خورما دەبات، لە ئاوێستادا ناوی حوشتری بردووە، کە هەموویان لە وڵاتـی عـەرەبدا هـەن؛هـەر بۆیـە زانایـانی انجیـل و تـەورات، گـاور و جولەکـە لەلایـەک و، زانایـان (پـیر) انـی ئاوێسـتا و زەردەشت لەلایەکی ترەوە، گوێ قوڵاغ بوون کەئـەو چـاوەڕوان کـراوە، لـە وڵاتـی عەرەبەوە سەر هەڵبدات .

# نوێنەرە کوردیەکان

## ١- پیروەت کوڕی بارام

(واقدی) [14] مێژوونوس شتێکی سەیر لە زیرەکی و وریایی و پابەندی زانا کوردەکانەوە دەگێڕێتەوە، کە چۆن لە بۆسەدا بوون بۆ هەواڵ زانینی پێغەمبەری ئیسلام، عاقڵمەند و ژیرێکی کورد بە ناوی (پیروەت کوڕی بارام) لە ناوچەی (مەرجێن) واتە (مەرگە)، هەموو جار دەچووە شام بۆلای ڕاهیبە گاور و جولەکەکان، بۆ هەواڵ زانینی پێغەمبەری چاوەڕوان کراو و، ڕا گۆڕینەوە.. ئەو کاتە کەئیسلام دێتە کوردستان، هەر بەئاشتی و ڕێکەوتن و وتووێژ هەموو ناوچە کوردیەکان - وەک بڵێی لەسەر نەخشەیەکی پێشتری بۆ داڕێژراو - موسوڵمان دەبن و لەسەر ئامۆژگاریەکانی زەردەشت دەچنە ناو ئەو ئاینە نوێیەوە.. ئەوەتا (پیروەت)ی زانای کوردی زەردەشتی، کەبەڕوداوەکەدا دیارە، دەمڕاستی هەموو ناوچەکە بووە، کەسوپای ئیسلام لەناوچەکە نزیک دەبێتەوە، بەخۆی و دوانزە کەس لە سەرۆکەکانی گەلەکەی دەچن بۆ (سیناجیان) بۆ ناو سوپای ئیسلام، ئەوانیش دەیان بەن بۆلای سەرکردەی سوپا (پیروەت) دەڵێ (ئارەزووی ئیسلام بوون ئەکەین) ئەمیری موسڵمانان زۆری پێخۆش دەبێ، ئیسلامەتی پێڕاگەیاندن و هەموویان موسوڵمان بوون.. [15] ئێستەش لە ناوچەی مەرگە باس و خواسی پیروەت هەر ماوە.. چاک وایە کۆبکرێتەوە.!!

## ٢- بوغدوز کوردی

(بوغدوز) کوردێکە، لەبەر زیرەکی و لێزانی خۆی بوەتە ڕاوێژکاری (ئۆغوز خانی تورکستانی) سەرداری تورکستان، ئەو کاتەی کە هەواڵی سەرهەڵدانی پێغەمبەری نوێ دەگاتە هەموو جێیەک، زۆر ناوچە و هەرێم نوێنەری خۆیان دەنێرن بۆ مەکە و مەدینە بۆ هەواڵ زانین و موسوڵمان بوون.. سەرداری تورکستانیش، بۆغدۆزی کوردی وەک نوێنەر دەنێرێ، هەتا هەواڵی بۆ بێنێتەوە.. بۆغدۆزی کوردی دەگاتە لای پێغەمبەر و وتووێژی تێر و تەسەل ئەنجام دەدەن بەڵام مێژوو نوسە تێکدەرەکان کە ئەم هەواڵە دەگێڕنەوە دەڵێن (بۆغدۆز) ئەوەندە ناشرین و ڕەزا گران بووە، پێغەمبەر بێزی لە چرچاوی هەڵقرچاوی هەستاوە و لەداخان نەفرینی لە هەموو کوردی سەر زەمین کردوە.. [16] ئەم ڕوداوانە و سەدانی تری لەو جۆرە بەڕێزتریش ڕووی داوە و ژیری و سەربەرزی کوردی نیشان داوە.. بەڵام دوژمنان،

لەسەر مێژویان کوژاندۆتــەوە، یـان بـەژەهرێکی کوشـنده دەسـکاری کـراوە، پێغەمبەری خاوەن بەزەیی و ڕەحمـەت، بێزی لـە چرۆچاوی کـەس نەهاتۆتـەوە، هیچ کەس و گەلێکی بەکـەم سـەیر نـەکردوە، بـەر لەعنـەتی نـەداون چونکـە.. أ- کورد ناشرین نی‌یـە، هـەرگیز لـە بلالـی حەبەشـی ڕەشـتر نـەبووە، کەپێغەمبـەر- درودی خوای لەسەربێ_ کردی بەبانگدەری ئیسلام و جارێکیش فەرمووی : بیـلال کـەمن لـە - ئیسـرا و میعـراج - چومـە بەهەشـت، دەبینـم پێـش مــن تـۆ لــەوێ ئامادەیت.. ! !

ب- پێغەمبەر، خواخوای بووە تاکە کەسێک بهێنێتــە سـەر ئاینەکـەی، نـەخوازەلا (بوغدوزی) کوردی کەنوێنەری سەرۆکی تورکستان بووە و، بـەناوی میللەتێکـەوە هاتوە.. لەو باوەڕەدام دەعوەتی بـۆ کـردوە و چـەند شـەو و ڕۆژ پێکـەوە بـوون، هەتا ئاینەکەی لێ حـالّی بکـات، بـۆ ئـەوەی بەڕاسـت و ڕەوانـی بـۆ ئۆغـۆز خـانی تورکستانی بگێڕێتەوە.. جگە لەوە پرسیارێک سەر هەڵدەدات : بۆچی ئۆغۆز خان لەو هەموو میللەتە تورکەدا، کوردێـک هـەڵدەبژێرێت و دەیکاتـە نوێنـەری خـۆی و میللەتەکەی..؟ بێگومان وەلامەکـە هـەر ئەوەیـە، کـە بۆغـدوزی کـوردی پیـاوێکی زیرەک و ڕاوێژکارێکی بـێ وێنـە بـووە و، جـوان و کەلەگـەت و بەشـان وشـەوکەت بووە.. چونکە لەجیهانی دبلۆماسیەتدا زیاتر هـەوڵ دەدرێـت (نوێنـەر) کەشـخە و زیرەک و پێکەوتە بێت..وە هەموو میللەتانی کۆن و نوێ ئەوەیان فامیوە..

(لستر برسـون) وەزیـری دەرەوەی کەنـەدا (نـۆ) ڕەوشـتی بـۆ سـەفیرو نوێنــەر داناوە، کە یەکەمیان جل و بەرگ و پاک و خاوێنی و شێوەی دەرەوەیە..[17]

(ابن الفراء) دەڵێ (بۆ نوێنـەر وا چاکـە، قـەدو بـالای ڕێـک و پێـک بێـت، بـەرزو گۆشتن و لاشەی بەخۆوەبێت، کورتە بنەو لاوازو بچوک نەبێت، باچاو شـەرمی لێ بکـات، وێنـە پێش دەم و زمـان بکـەوێت، شـێوەی لاشــەی ئـەوەی نـاو نـاخی بشارێتەوە..)[18] (عومەر) دەفەرموێ (کە مۆڵەتتان دەدەن، با ئـەوەتان پێش بکەوێ کە ناوی جوانترە، کە چونە ژورەوە، با ئــەوەتان پێـش بکـەوێ کـە دەم و چاوی جوانـە.. کـە قسـەتان کـرد گـوفت و زمـان شـیرینی جیاتــان دەکاتــەوە) (سـەفیر محمـد تـابعی) دەڵـێ (زۆربـەی خـەڵک جـل و بـەرگ و شـکل و شـێوە دەخوێننەوە، پاشاکانیش هەر ئەوەیان بەلاوە لە پێش ترە، کە جـوان و پێکەوتـە بێ.. لەبەر ئەوە پێویستە (سەفیر) لاشـەی بـەخۆوە بێـت، بـە جۆرێـک کـە چـاو پڕ بکات، دەرونـی مـرۆڤ هەمیشـە مـەیلی بـەلای گۆشـتن و بالابـەرزو

جوانیایه، ڕێزی دەگرێ.. جوانی جل و، جوانی قەدو باڵا سحرێکە بەرامبەر دەخەڵەتێنێ.. پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێت- (دحی الکلبی) هەڵبژاردو کردی بە نوێنەر بۆ لای (هەرقل)وە سەرکەوتوبوو، چونکە جل و بەرگ و قەدو باڵای جوان بوو، زمانی پاراوو ژیر بوو، دەیزانی نوێنەری کێیەو چی دەڵێ..هەتا ئێستەش لای هەموو جیهان ئەو ڕێنوماییە بەردەوامە، کە شێوەی دەرەوەو جل و بەرگ بۆ نوێنەر پێویست و کاریگەرەو سەرنجی بەرامبەر ڕادەکێشێ، چونکە یەکەمجار شێوەی دەرەوە دەردەکەوێ، بینەر سەرسام و سەرنجی ڕادەکێشێ.. لەهەمان کاتدا جوانی و بەرگ و شێوەی دەرەوە هەموو شت نیە، خۆ جل و بەرگ قسە ناکات.. جل و شێوە یاریدەدەرە، زیرەکی و ڕەوشتی جوان و خۆشگوفتاری و زمان پاراوی، لەژێر ئەو جل و باڵایەدا نوێنەر تەواو گەورە دەکات.. (عامری کوڕی شەرحەبیل) لاوازو بچوک بوو، بەڵام ئەو هەموو زەین و زیرەکی و زانیاری و زمان شیرینیە، هەمووی داپۆشی بوو.. جلی جوان و باڵای بەرزی بێ ناوەرۆک و کاکڵە، چەند ناشرینەو لە شێوە کەم دەکاتەوە.. هەروەک (کالبیر) نووسەرو سەفیری فەرەنسی دەڵێ: حکومەتان دەتوانن سەفیری فەقیرو هەژار پڕ بکەن لە پارەو جل و بەرگی جوان، بەڵام ناتوانن سەفیری دەوڵەمەند پڕ بکەن لە زەین و دەماغ و ژیری..[19] لەبەر ئەوە بە ئاشکرا ڕوونە کەئەو قسەیە، بۆ بۆغدوزی کوردی و پێغەمبەر بوختان و دروست کراوە، نوێنەریەکە ڕاستەو فەخرو شانازیە، بەم شێوەیەی کەوتمان، نەک بەبوختانی نووسەرە بوغزاوی و ڕۆژهەلات ناسە تێکدەرە غەیرە دینەکان.

ج- پێغەمبەری ئیسلام وەکو خوا دەفەرموێ (وما أرسلناك الا رحمة للعالمين) هەزار و یەک شێوازی بۆ تاک وکۆمەڵ بەکارهێناوە هەتا تێیان بگەیەنێ و، چاکترین هونەری بانگەوازی پیادە کردووە هەتا کەس نەتۆرێ.. هەرگیز نارێکی لەدڵ و دەرون و ڕەوشتیا نەبووە، چونکە (وما ينطق عن الهوى ان هو الاوحيٌ يوحى) یان (و انك لعلى خلقٍ عظيم) و (ولو كنت فظاً غليظ القلبِ لانفضوا من حولك) ئەگەر تورەو دڵ بەکینە و ڕقاوی بوایە کەسی بەدەوردا نەدەمایەوە.. پێغەمبەر لە چەندین جێ دا خۆی باسی ئەو تاوانە دەکات کە نابێ لەعنەت لەکەس بکەین (ليس المؤمن بالطعان ولا اللعان ....)[20] کەچی دێن ئەو درۆیەی بەدەمەوە هەڵدەبەستن.(من كذب عليَّ متعمداً فليتبوأ مقعده من النار)[21] چاکتر وایە مێژووی دێرینی تورکستان بگەڕێین، هەتا کەسایەتی بۆغدوز و ڕاستی ئەو نوێنەریە و

نهێنیەکانی سەفەرەکە و دەوری ئەو پیاوە لە حکومەتی تورکستانمان بۆ دەرکەوێت . نەکێ بە دیار بوختانەوە دەستەوئەژنۆ بین.

## ٣- بازرگانەکانی هۆزی (باجن) ی‌لای بۆتان

ئەمەش باسێکی تری شکۆداری مێژووی کوردە، کە دوژمنان بە ئەنقەست ئاوەژوویان کردووە، ئەمەش سوچێکی تری مێژومانە کە(ون) بووە و ناحەزان پەردەیان پیاداوە و تێکیان داوە، هەتا ئەو گرنگی و مەزنیە ئاشکرا نەبێت، وەئەگەر ئاشکراش بوو بەو ژەهراویە بەرچاو بکەوێت.. ئەو نووسەرانە نەیانزانیوە ئەو بوختانە هەر ئاشکرا دەبێ.

ئەو کاتە کە موسوڵمانەکانی مەککە کۆچیان کردبوو بۆ مەدینە، بازرگانی و ئالوگۆڕی شتومەکێ لەنێوان شام و حیجاز و ولاتی فارس دا بەردەوام بوو، (شارەزوور) لە کوردستانی باشوور کەلەژێر دەستی فارس دا بوو، (بۆتان) لە کوردستانی باکوور کەلەژێر دەستی ڕۆم دا بوو، لە پێش ئیسلامدا مەڵبەندی خوێندەواری بوون بۆ کوردەکان.. زانایانی کوردی تیا کۆبوبویەوە..[22] لەم دوو جێیەوە بەتایبەت دوو وەفدی کوردی دەگەنە حیجاز و هەواڵی ئەو پێغەمبەرە نوێیە دەپرسن، وەفدێکی بازرگانی کوردی لە هۆزی (باجن) لە بۆتان بەنهێنی ڕۆمەکان دەنێرێنە (طائف) و لەسەر دەستی پێغەمبەردا-سەلامی خوای لێ بێت- موسوڵمان بوون و هەواڵەکەیان بۆ کوردستان گێڕاوەتەوە.. دوژمنانی کورد هاتوون وشەی (باجن) یان تێکداوە و لەوێوە باسە مەزنەکە و هەنگاوە پیرۆزەکەیان شێواندووە، لەڕۆژەوە (باجن) کراوەبە (جنی نوسەیبین)گوایە هەموو نەتەوەی کورد لەسایەی ئەو نۆ موسوڵمانانەوە لە تیرەی ئەو جنۆکانەن کە سەرپۆشیان لەسەر لادراوە..[23] کێ باوەڕ دەکات کەگەلێکی سروشت مرۆڤ لە (جنۆکە) پێک هاتبن، هەموو دەزانین جیهانی مرۆڤ و جیهانی جنی لە پێکهاتەیاندا جیاوازن.. بەزۆری ئەم ووتانە لە(مروج الذهب)دا هاتووە.. لەو بڕوایەدام مەسعودی و ابن كثير و طبري و زۆری تر زانای ئاینی بوون و لە قورئان و حديث شارەزا بوون، هەڵەی لەو جۆرە ناکەن.. بەڵکو لەکاتی هێرشی سەربازی و ڕۆشنبیری گاور و جولەکە و ماسۆنی‌یەکاندا بۆسەر ولاتانی ئیسلام زۆربەی دەستنووس و نوسراوی موسوڵمانەکانیان برد و خرایە مۆزەخانە و دەسکاری کرا پاشان هێنایانەوە و چاپیان کرد، بە تایبەت (مروج الذهب ) ی مەسعودی کەبرایە ئەوروپا لەوێ چاپکراو هێنرایەوە..[24] مەسعوی لە (مروج الذهب) دا

هەندێ هۆزی کورد دەباتەوە سەر ئەسڵی عەرەب، بەڵام دوای لێکۆڵینەوە تێدەگا وانی‌یە، لە کتێبێکی دوای ئەودا (التنبیه و الاشراف) دەیان کاتەوە بەکورد.. خائنان ئەزانن، هەرچی بکەن بەزەرەری خۆیان تەواو دەبێت.. ویستویانە ناهەقیەک بکەن، بەڵام ڕاستی‌یەکی شاراوەیان ئاشکرا کردوە ئەویش سەردانی ئەو وەفدە کوردیەیە بۆ حیجاز..

ئەمە مێژوویەکی شکۆدار و، سەربەرزیەکی گەورە و گران و بەنرخە بۆ کورد، لە قۆناغی ئاوا ترسناک دا پێی هەڵساون.. لە کاتێکدا کە تەنانەت خزمەکانی (محمد) باوەڕیان پێ نەکردوە و شاربەدەریان کردوە،بەڵام کورد ڕێی دوور و درێژ دەگرێتە بەر و بەناو ئەو هەموو دوژمنەدا، هەزاران کیلۆمەتر دەبڕێت، لەشاخ و فێنکی کوردستانەوە دەگاتە گەرمی بیابان.. جێی خۆی بوو تەواوی خۆئامادە کردن و بەڕێ کردنی ئەو نوێنەرانە و چۆنێتی ڕۆیشتن و گەیشتن و پێشوازی و ووردی وتووێژەکانمان بزانیبایە.. نەک ئاوا لەژێر بوختانێکدا دەریانبهێنین بیانتەکێنین و چەند پارچەیەکیان بەدەستەوە بقرتێ.. یان قورسی بوختانەکە نەهێڵێ دڵ بۆ تەواوی ماناکان بکەینەوە.. ئەمانە هەرچۆنێک بێت ڕوون دەبێتەوە، بەڵام داخی زۆر بۆ ئەو هەموو هەواڵە گرنگانە کە سوتێنرا و،لە مێژووی کوردیان سڕیەوە..

چونی کورد بۆ مەککە و مەدینە بە نوێنەری بوو، جیاوازە لە ئامادە بوونی بلالی حەبەشی و صهیبی ڕۆمی و عەداسی نینوایی و سەلمانی فارسی، بلال پێش ئەوەی ئیسلام بێت،عەبدێکی فرۆشراو بوو لە مەککە، ابوبکر کڕی و ئازادی کرد، صهیبي ڕۆمی ئاسنگەر بوو لە مەککە پاشان موسوڵمان بوو، عەداسی نینوایی باخەوانی کابرایەک بوو لە طائف، کە پێغەمبەریان بریندار کرد، لایدایە باخەکەی عەداس، ئەویش ڕێزی گرت و موسوڵمان بوو، سەلمانی فارسی، کەسێکی گەڕۆک بوو، بەدوای ڕاستیدا دەگەڕا بۆ خۆی، نەک بۆ میللەتەکەی، هەتا لە مەدینە گیرسایەوە.. بەڵام چونی کوردەکان بە نوێنەری میللەتی کورد بوو تا هەواڵ بێننەوە بۆ گەلەکەیان و گەلانی تر..

کوردەکان بەپێی خۆیان چوون بەدەم ئیسلامەوە، بۆیان نەهێنان.. هەر بۆیە بەهاتنی سوپای ئیسلام جەنگێکی وای شایانی باس لە کوردستاندا ڕووی نەداوە.. جیاوازی زۆرە لەنێوان کەسێک بۆی بەری و، کەسێکی دی خۆی بچێ بەدەمیەوە، کوردەکان لە چونەکانیاندا بەتەواوی قەناعەت و ئارەزووی دڵ و باوەڕ و

دڵسۆزیەوە بوو، نەک وەک نوێنەری عەرەبەکانی جزیرە.. لەدوای گرتنی مەککە، هەموو لایەکی نیوەدورگەی عەرەبەوە نوێنەری ئەعراب و عەشایرە عەرەبەکان هاتن، ئیسلام بوونی خۆیان ڕاگەیاند.. بەڵام هەر یەکەیان بۆ مەبەستێک بوو، کەلەناخیاندا شارابۆوە..پاشان دەرکەوت وەک لە (البداية و النهاية) بەدرێژی باسی دەکات.. زۆربەیان لە ترسان بوو، یان بۆ ئەوەی دەسەڵاتیان پارێزراو بێت، یان خۆیان دەبردە پێشەوەو سەرۆکێکی تریان دەشکاند، سەرۆکی (بنی عامر) ووتی دەبێ خۆم و خۆت تەنها بین، پاشان خوا ئاگاداری کردەوە کەنیازی کوشتنی پێغەمبەری هەبێت، دەی فەرموو نابێ (عارەق) بخۆن، دەیانگوت ناتوانین، نابێ (سوو) بخۆن، دەیانگوت هەموو سامانمان لەسەر سوو دامەزراوە.. کەدەگەڕانەوە گاڵتەیان بە موسوڵمانەکان دەکرد و ڕاستیەکانیان نەدەگەیاند، تەنانەت (طليحه) و (مسلمەی ئەسوس) کە گەڕانەوە پڕوپاگەندەی پێغەمبەرێتیان دەکرد، هەر بۆیە دوای وەفاتی پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر بێت - هەڵگەڕانەوە ڕوویدا، بەجۆرێک کە ترسی گەورەی لەسەر سیستەمی ئیسلامی دروست کردبوو، دوو ڕوەکان گەشانەوە و خنەخنیان تێکەوت.. دەیان گوت نوێژ دەکەین بەڵام زەکات نادەین، دوای ئەسپەردە کردنی لاشەی پێغەمبەر، کە نوێنەرەکان گەڕانەوە، پڕوپاگەندەیان دەکرد کە حکومەتی مەدینە لاوازە و سەربازەکانیان ناردوە بۆ شام، دەیانگوت باهێرش بکەینە سەر مەککە و مەدینە، لەوا بوو فارس و ڕۆم دەستی تێبخەن.. تەنانەت عومەر و زۆر سەرکردە ترسان، بەڵام ابوبکر (١١) لیوای دروست کرد و زۆر بەزوویی هەموویانی لەناو برد.. ئەمە کاری عەرەبەکانی خزم و هاوڕەگەز و نزیکیان بوو.. ئەوەش وەڵامی هەستی کوردی دوور..!! نەمدیوە لە مێژووی هیچ میللەتێکدا، لەهەموو لایەکەوە بەم قەرەباڵغیە سەریان لە پێغەمبەر دابێ و ئیسلام بوونی خۆیان ڕاگەیاند بێ.. ئەگەر ئەمە مانا لە شتێک بکات، هەر ئەوە دەسەلمێنێ کە کورد خاوەنی فطره ی پاک و ڕەوشتی بەرز بوون، بەدوای ڕاستیدا گەڕاون.. لە کاتێکدا کەمیللەتانی تر بەزۆر بێ یان بە خۆشی ئیسلامیان بۆ براوە.. بەڵام کورد بەزەین و پێی خۆی بەدوایدا گەڕاوە و پەیدای کردوە.

## دەستێوەردانی مێژوو

دەستێوەردانی مێژووی کەسان و میللەتان کارێکە و بەردەوام ڕووی داوە، واچاکە لێرەدا دوو نمونە لە دەستێوەردانی مێژوو لە کۆن و نوێ دا بهێنمەوە.. هەتا

باسەکانمان لەلا ڕوون بێ، یەکەم : مێژوونوسـان لەهـەندێ لـە (فەراعنـە) مسریە کۆنەکان دەگێڕنەوە، کـەپێش چوارهـەزار سـاڵ لەمـەوپێش، هـەر لـەو کاتـەی کـە مێژوو لەسەر بـەردی ڕەق و تـەق دەنوسـرایەوە و هـەڵدەکۆڵرا.. کـە فیرعـەونێک دەسـەڵاتی دەگرتـە دەسـت، هـەرچی نـەخش و نوسـراوی سـەرکەوتنە جـەنگی و پاڵەوانیـەکانی پاشـایانی پێشـوو هـەبوو، دەیکوژانـدەوە و هـەندێ ڕوودا و سـەرکەوتنی تـری بـەدرۆوە بـۆ خـۆی تۆمـار دەکـرد، کەبەخـەویش نـەیدیبوو.. بیناسازی و ئاوەدانی و کاری چاکەی پێشوەکانیان بۆ خۆیان دەنوسی کـە ئـەمان پێ ی هەڵنەسابوون..
دووەم : لەسـاڵی ١٩٢٤ کـە (لینـین) مـرد، سـەرکردەی شۆڕشـی ڕوسـیا بـوو.. ناکۆکیەکی توند ڕویدا، بۆ وەرگرتنی دەسەڵات لەنێوان (سـتالین) و (ترۆتسـکی) کە هاوڕێی خەبات و گیانی بە گیـانی یـەک بـوون.. کۆتایەکـەی بەسـەرکەوتنی سـتالین و دەرکردنـی ترۆتسـکی هـات.. دوای ئـەوە سـتالین ڕووی کـردە هـەموو دەستنوس و بەڵگەنامەکانی شۆڕش.. هەرچی کارێک کـە ترۆتسـکی بـۆ شۆڕشـی ئۆکتۆبەری ئەنجام دابوو، سـتالین کوژاندیـەوە، کتێبـی هـەموو (دائـرة المعـارف)ەکانی سەر لەنوێ چاپ کردەوە و، جێ دەسـتەگرنگەکانی ترۆتسـکی تیـا شێواند و تێکی دا.. تەنانەت ئەو وێنە و تابلۆ زەیتیانەی کەهونەرمـەندە شێوەکارەکان بـۆ ڕوداوەکانی شۆڕشیان کێشابوو، لە مۆزەخانەکاندا هەڵواسرا بوو، ستالین بە فڵچـە و بۆیە دەمووچاوی ترۆتسکی لەسەر کوژاندەوە لەو جێیانـەی کـە دەرکـەوتبوو.. تەنانـەت ژمارەیـەکی زۆر لـە وێنـە فۆتۆگرافیـە گرنگـەکانی ئەرشـیڤی هێنـا و گۆڕانکاری تیا کرد..[25] دەسەڵاتدارەکان ئەگەر بۆخۆیان ئاوا بکەن.. ئـەی دەبـێ چی بە مێژووی کوردی بـێ دەوڵـەت و سـوپا و دام و دەزگـا کرابێـت، کەهەمیشـە بەدەم ڕەشەبای هەموولایەکەوە بوەتە دەواری شەڕ..

## ٤- جابان الکردی

لەزۆر سـەرچاوەدا باسـی (جابـانی کـوردی) و کوڕەکـەی هـاتووە، پێـش ئـەوەی لـەباس و خواسـی بکۆڵینـەوە، ئـەوەندەی دەسـتمان کـەوتوە لەسـەرچاوەکان دەیخەینـە بـەردیدی خوێنـەران هـەتا ئامـادەتر بێـت بـۆ ئـەوکاتەی زیـاتری لـێ دەکۆڵێتەوە.
مامۆستا ئەمین زەکـی دەڵـێ (قـەومی کـورد هـەر وەکـو مئـەریخینی موعتەبـەرە ئەڵێن لە شانزەهەمینی ساڵی کۆچیدا بەرامبەر ٦٣٧ی زاینـی دا لـە دوای فـەتحی

حەلوان و تکریت لەگەڵ ئۆردوی ئیسلامدا تەماسیان کرد.. بەلام پێویستە بزانین لە پێش ئەم تەئریخەشدا بەعزێ تەماس و ئیهتیدای کورد واقیع بووە مەسەلەن مەرحوم ئالوسی ئەفەندی لە تەفسیری (روح المعانی) دا لەناو ئەسحابی کیرامدا باسی جابان (کابان) ی کوردی و مەیمونی کوڕی ئەکا کە کونیەی ابو بصیرە [26] چەند حدیثێك لە کابان الکردی‌یەوە نقل دەکا و مەحتەمەلە هەندێ صحابی‌تری کوردیش بوبێت.. )[27] ئەم وتەیەی ئەمین زەکی بەلای منەوە لە هەموو باسەکانی تری بۆ ئەم ڕووە گرنگترە و پاڵپشتی ئەو ڕایە دەکات کە پێش ئەوەی سوپای ئیسلام بێتە کوردستان پەیوەندی و نوێنەری و وتوویژ و ڕێکەوتن لە نێوان کورد و موسوڵمانەکاندا بووە و بە تایبەت ناوی جابان و مەیمون دەبات.

(ابن حجر) لە (الاصابة) دا دەڵێ :

( (١٠٠٨) (جابان) والد میمون.. روی ابن منده من طریق ابي سعید مولی بني هاشم عن ابي خالد، سمعت (میمون بن جابان الكردي) عن ابیه انه سمع النبي (ص) غیر مره حتی بلغ عشراً، یقول : من تزوج امرءة وهو ینوي ان لایعطیها الصداقه لقی ا الله وهو زان) [28] قلت كذا عن ابیه ان كان محفوظاً..

١- مادەم فەرمودەکە باسی مارەیی دەکات، کەواتە باسی مەدینەیە..

٢- مەیمون لە جابانی باوکی دەگێڕێتەوە و دەڵێ باوکم (دە) جار لە پێغەمبەری بیستوە، کەواتە جابان زۆر لەگەڵ پێغەمبەردا بووە و لە نزیکی‌یەوە ژیاوە.

٣- جابان بە (صحابە) سەرژمێر کراوە چونکە لەگەڵیدا ژیاوە.

٤- جابان (محدث) بووە چونکە فەرمودەی لێ گێڕاوەتەوە..

(ئەمین زەکی) دەڵێ (مەرحومی (ئالوسی) لە تەفسیری (روح المعانی) دا و لەناو اصحابي کرامدا باسی (جابان) (کابان الکردی) و (میمون) ی کوڕی دەکات کە کونیەی (میمون)،(ابوبصیر)ە

١-کونیەی میمون کوڕی جابان (ابوبصیر) ە.

٢- ڕەنگە صحابەی تریش بوبێ..

٣- لای ئەمین زەکی جابان بوبە (کابان).

٤- دوای گرتنی حلوان و تکریت لەگەڵ ئۆردوی ئیسلامدا پەیوەندی کراوە نەك شەڕ، پێش ئەوەش هەندێ پەیوەندی و نوێنەری بووە.

(یەحیا خەشاب) دەڵێ (کوردان زۆر شانازی دەکەن کە هاوەڵێکی پێغەمبەر ناوی (گابانی کوردی) بووە و کوڕی گابان کەناوی میمون (ابو بصیر) بووە لەلای

کورد زۆر خۆشەویستە و لە پێغەمبەرەوە نزیک بوون و فەرمودەکانی لەبەر بوون.[29]

١- کونیەی میمون (ابو بصیر)ە.

٢- لای یەحیا خەشاب بوو بە (گابان).

٣- فەرموودەی تریشی لەبەر بووە..

دووبارە لە (الاصابە)دا لە ژمارە (٥٣٩٧) هاتووە : (عتبە) ابن اسید ابن عوف بن ثقیف (ابو بصیر) حلیف بني زهره)[30]

١- کەسێکی تر بووە ناوی ابو بصیر بووە بەو ناوەی سەرەوە و حەلیفی بەنی زوهرە بووە، ئەمەیان کەسێکی ترە.

لە حاشیەی (الاصابە)دا نوسینی (ابن عبد البر) هاتووە : ابوبصیر اختلف في اسمه و نسبیه.. فقیل عبید ابن اسید بن جارية، بن عبدا لله بن سلمی بن عبدا لله بن غیره..[31]

١- لە حاشیەکەدا دەڵێ جیاوازی هەیە لەناو و ڕەگەزی ابوبصیر دا.

٢- ابو بصیر بۆ جاری سێیەم بە ناوی (عبید بن اسید بن جاریه) هاتووە.

ئەم ناوە واتە جابان و (میمون) ابو بصیری کوڕی لەم سەرچاوانەدا هاتووە :
(مروج الذهب) ی مەسعودی و (دائرة المعارف الاسلامية) و (طبقات الكبرى) ی، (تاج الدين السبكي) و (قاموس المحيط) ی فەیرۆز ئابادی و (مغازی) ابن اسحاق و (الفتوح) ی (الواقدی).. وە دکتۆر خەلیقی (میمون) بە (مئمون) ناو هێناوە..

دکتۆر خلیقی دەڵێ (ئەگەر زۆر پێ لەسەر ئەوە دانەگرین، کە زۆر لە یارە نەخوێندەوارەکانی پەیامبەر وتەیان لەو گێڕاوەتەوە، وێ دەچێ جابانی ئێمەش لەوان بێ، ئەگەر بەدڵ فراوانیەوە سەرنجی شتەکە بدەین دەکرێ بڵێین لەو چاخەدا لە کوردستاندا خوێندەواری هەبووە.. لەبەشێک لە کوردستان بەناوی هەورامان کە ناوچەیەکی شاخاویە و داوێنەی باشووری شارەزوور و کێوی بەمۆ و سەلاسی باوەجان (جوان ڕۆ)..[32]

ابن اسحاق دەگێڕێتەوە (ابو بصیر کوڕی کابانی کوردی، یەکێک بووە لەوانەی کە حەپس کراوە لە مەککەدا)[33] (السحار) دەڵێ (قورەیشیەکان اابابصیریان لە مەککە بەند کردبوو نەیان دەهێشت کۆچ بکات بۆ مەدینە، هەتا هەلێکی بۆ ڕەخساو خۆی دەرباز کرد..[34]

١- لە کوردستاندا لەوکاتەدا خوێندەواری بووە.

٢- لای (ابن اسحاق و طبري) ابو بصیر کوڕی گابانی کوردیە.

٣- (میمون) ابو بصیر لە مەککە حەپس کراوە.
٤- خەریکی کارێکی دژ بە قورەیشەکان بووە، کە دەبێ هەر بانگەوازی ئیسلامی بوبێ..
٥- کەواتە هەر لە قۆناغی نهێنی مەککە وە موسوڵمان بوون و شەرەفی سەرەتای بانگەوازیان بووە بە نسیب..
٦- هەوڵی دەرباز بوونی داوە بەڵام گرتویانەتەوە و سزا دراوە.
٧- هەلی بۆ ڕەخساوە و گەیشتۆتە مەدینە.
٨- بەرەو مەدینە هەڵهاتووە، کەواتە لەسەر ئیسلام گیراوە.
دکتۆر خلیقی دەڵێ(ابو یەحیا) مەهدی کوڕی مەیمونی کوڕی جابان یەکێک بووە لە زانایان و پارێزەرانی ووتەکانی پەیامبەر - لە کوردستان - لە ساڵی ١٧٢ ی کۆچی دا وەفاتی کردووە..[35]
١- بەم سەرچاوەدا دیارە کە خێزانی جابان گەڕاونەتەوە بۆ کوردستان (ابو یەحیا) لەسەر ڕەوتی باوک و باپیری زانای حدیث بووە.
٢- کەواتە کوردستان جێی ئەسڵیانە و بەکارێکی گرنگ و کەم ماوە لە کوردستانەوە نێرراون بۆ مەککە و کە جێبەجێ بووە گەڕاونەتەوە.. کەوابوو ئەو بۆچونە نزیکە کە جابان بە خاوخێزانەوە بە نهێنی فارسەکانەوە لەلایەن (نەوەد ونۆ) پیرەی هەورامان و شارەزوورەوە نێرابێ بۆ هەواڵ زانینی پەیدا بوونی پەیامبەری چاوەڕوان کراوی ناو مژدەکانی ئاوێستا.. ئەگەر دەرکەوێ (ابو یەحیا) مەهدی کوڕی میمون لە کوێ ژیاوە و مردووە، کەواتە لەو جێیەوە نێرراون و گەڕاونەتەوە.. لە ڕیوایەتەکانی دوایی هەموو سەرچاوەکاندا وا باس دەکەن کە ابو بصیر لەدوای سوڵحی حودەیبیە لە مەککەوە ڕادەکات بۆ مەدینە، چیرۆکی گەرم وگوڕ و سەرکەوتوی لێرەوە دەست پێ دەکات، بەڵام بەردەوام هەر تەم و مژ لە نێوان ئەو سێ (ابو بصیر)ە داهەیە کەباسمان کرد، ڕوون نی یە بە تەواوی خاوەنی ئەم چیرۆکە کامیانە بەڵام، لەبەر ووتەکەی (ابن عبد البر) کەلە حاشیەی (الاصابە) دا دەڵێ (ابو بصیر اختلف في اسمه و نسبيه).. واچاکە ئێمەش هەروا بەئاسان لە کوردی دانەبڕین و چیرۆکەکەی بگێڕینەوە، ڕوداوی (ابو بصیر) چیرۆکێکی تاکتیکی پارتی زانی یە، بە جۆرێک کە ئەو باس و خواس و جەنگانە هەر لە کوردێکی گۆش کراوی کێوەکانی کوردستان دەوەشێتەوە، ئەم جۆرە جەنگانە بەدرێژایی مێژوو نمونەیان لای کورد زۆر بووە، گەڕانەوەی (دە) هەزار

یۆنانیەکەی زەینەفۆن،اجەنگی ڕێگری وکێواوکێوی کوردەکان،وێنەیەکی ئەو جەنگە پارتی زانیەیە کەلە (٤٠١) ی پێش زاین دا ڕووی داوە..[36]
بەلام ئێمەش بۆچی لە (مەیمونی کوڕی جابانی کوردی) لابدەین کە هەموو ڕەوشت و هەڵویست و پەناو بەکارهێنانی شێوازە جەنگیەکەی،لەکاری (کورد) دەچێت، مافی خۆمانە بە کوردی لەقەڵەم بدەین، هەتا لە لێکۆڵینەوەی تردا، یان زیاتر دەچەسپێ، یان یەکێکی تر ڕایەکی بەهێزتر دەهێنێ.. چونکە سەرچاوەی ئیسلامی زۆرەو هەردەبێ قوڵتر بۆی دابچین، بۆ ئەبو بصیری یەکەم و دووەم ڕاو و گفتوگۆ زۆرە بەلام بۆ سێهەم لەهیچ جێیەکی تردا باسی نەهاتوە.. حیزبی بەعس لە بلاوکراوەکانیدا لەسەر سەلاحەدینی ئەیوبی،لەو جێیانەدا کە سەلاحەدین سەرکەوتووەو حەکیمانە کاری کردووە دەڵێ(ئەو پاڵەوانە عەرەبیە) بەلام کە شکستیەکی بەسەردا هاتووە دەڵێ (من دم کردی) یان (من نسب واصل کردی) وەکو عەرەب هەرگیز لە فەلەستیندا شکستی بەخۆوە نەدیبێ..

## ابو بصیر

چیرۆکی ابو بصیر، بیرۆکەی ڕۆمانێکی ناوازەیە بۆ کەسێک کەلەو مانایەدا تاوابێتەوە و بیەوێت بەرهەمێک بدات، بەناوی (لەشاخەوە بۆ شاخ) .. هەموو دەزانین کە لە قۆناغی نهێنی مەککەدا چی بە بلال و یاسر و سمیە و موسولمانەکانی تر کرا.. یەکێک لەو بەند کراوانە ابو بصیر بوو..[37] ابن اسحاق دەڵێ (ابو بصیر یەکێک بوو لەوانەی لە مەککەدا خرایە بەندیخانەوە)، سەحار دەڵێ (قورەیش ابو بصیریان بەند کرد و ڕێیان لێ گرت کۆچ بکات.. بەلام خۆی دەربازکرد و گەیشتە مەدینە).[38] کەدەگاتە مەدینە، زۆر نییە کە موسولمانەکان ڕێکەوتنێکی شەش بەندیان لەگەڵ قورەیش مۆر کردووە بەناوی (صلح الحدیبیە) یەکێک لەبەندەکانی - بەندی سێیەم - کەبەزۆر بەسەر محمد دا فەرز کرا، بە ابو بصیر نەبێت هەڵناوەشێتەوە.. دڵی عومەری پێ ئاو دەخواتەوە و زۆر لە براوادارەکانی ناو مەککەی پێ ئازاد دەبێت.. ئەو بەندە سوکایەتی تیا بوو بە موسولمانەکان، بەلام پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر بێ - بۆ حیکمەتێک مۆری کرد، کەئەمەش کورتەی ڕووداوەکەیە :
ساڵی شەشەمی کۆچییە.. شوێن مەدینەی منەوەرەیە.. شەوێکی قەترانی ڕەش .. دڵی بەئاگا و خەوتووی موسوڵمانان، وەک مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە..

پێغەمبەر لەماڵەوە بەشەو نوێژەوە خەریکە، بەلای ڕاستدا بەچاوە بەفرمێسکەکانیەوە چووە خەو.. بەڵام دڵی پێغەمبەران لەخەویشدا بەئاگان (اذا نامت عيناي لا ينام قلبي).. مەککە هەر بەدەست بت پەرستانەوەیە، کەچی ئەم خەوێکی سەیری دی.. ئەوا خۆی و هاوڕێکانی چونەتە مەککە و بەسەرتاشین و قژ کورت کردنەوەوە خەریکن، تەوافی کەعبەیان کرد.. خەبەری بویەوە.. پێش ئەوەی بلال بانگ بدات بە ڕوویەکی گەش و مژدە ئامێزەوە بەرەو مزگەوت کەوتە ڕێ.. بیر لە گەنجی خۆی و ناو شاری مەککە و سزا و ئازاردانی ئەو کاتەی دەکردەوە.. دەنگی بلال بەرز بویەوە و لەهەموو کوچە و کۆڵانێکەوە جیکەو دەنگی دەرگای کراوە دێت بەرەو مزگەوت کەوتنە ڕێ.. دوای سەلام دانەوەی نوێژ، ڕووی تێ کردن و بەڕویەکی شیرینەوە خەوەکەی بۆ گێڕانەوە.. هەموویان وەک گوڵ گەشانەوە.. تەواو بڕوایان پەیدا کرد، بەزۆر بێ یان بە خۆشی، فەتحی مەککە نزیکە..چونکە خەوی پێغەمبەران ڕاست و دروستە و دێتە دی .. پێغەمبەر داوای لێکردن کۆچ و بار بپێچنەوە، نیازی عەمرەی هەیە بۆ مەککە.. ناردی بەشوێن هەموو هۆز وتیرە عەرەبە موسوڵمانەکاندا.. هەندێک ترسان.. بەڵام زۆریان بەدەنگیەوە هاتن.. نوێژی نیوەڕۆیان بردە (ذي الحليفة) هەر لەوێ ئیحرامیان بەست، چەکیان تەنها شمشێر بوو، چونکە پێغەمبەر فەرمووی حەز ناکەم بۆ عەمرە چەکم پێ بێ، هەتا بۆ قورەیشیەکان بسەلمێ، تەنها بۆ زیارەتی ماڵی خوا هاتوین.. یەکێک هاتەوە و ووتی : قورەیشیەکان بیستویانە و بۆمان دەرچوون.. دووسەد ئەسپیان پێ بوو ناردنیە بەردەم خالد، لە جەنگی بەدر دا یەک ئەسپیان پێ بوو، خوای گەورە داوای کرد دەبێ ئەسپ پەیدا بکەن (و من رباط الخيل ترهبون به عدو الله و عدوكم..)، چونکە ئەسپ بۆ جەنگ ترسناکە، ئەوانیش تا ئەمڕۆ دووسەد ئەسپیان پەیدا کردووە، بانگی نیوەڕۆی داو هەموو نوێژیان کرد، خالد ووتی ئائێستە هێرش بکەینە سەریان هەرایان پێ دەکەین.. بوەستن بۆ نوێژی دوای ئەمە.. جبرائیل بە ئایەتی (صلاة الخوف)ەوە دابەزی کە نوێژی شەڕ و تەنگانە بوو.. کە نوێژی عەسر هات وایان کرد.. خالد ووتی سەیرکەن چۆن هەواڵی نیازەکەی ئێمەیان پێ درا.. لە ڕێیەکی ترەوە ڕۆیشتن بەرەو مەککە بەڵام حوشترەکەی پێغەمبەر لە ناوچەی حودەیبیە خۆی دایەلاو نیشت، هەموو دابەزین..(عوسمانی) بە نامەیەکەوە نارد بۆ لای سەرانی قورەیش بڵێ : ئێمە بۆ زیارەت هاتووین نەک بۆ شەڕ، سەرانی قورەیش ووتیان ئەی

عوسمان،ئەگەر خۆت زیارەت دەکەیت فەرموو، ئەویش ووتی من چۆن بە بێ پێغەمبەری خوا زیارەت ئەکەم.. عوسمان بە نهێنی سەری لەماڵی خزمان و موسوڵمانەکانی ناو مەککە داو مژدەی دانێ و گەرم و گوڕی کردنەوە و پەیمانی پێ نوێ کردنەوە.. قورەیشیەکان عوسمانیان ئاگادار کرد و ترساندیان کە چۆن شتی وا دەکات.. هەواڵ هات کە عوسمان کوژراوە.. پێغەمبەر بەیعەتی لە هەموویان وەرگرت بۆ تۆڵە، بەڵام عوسمان بەسەلامەتی هاتەوە.. قورەیش (سوهەیل) یان نارد بۆ ڕێکەوتن و،لەسەر شەش خاڵ ڕێکەوتن،کە خاڵی سێهەم (هەرچ کەس لای قورەیشەوە بەبێ پرس هات بۆلای محمد بنێرێتەوە، هەر موسوڵمانێکیش چو بۆلای قورەیش بابڕوات..) ئەم خاڵەیان دڵی موسوڵمانەکانی ئازاردا، بە تایبەت عومەر بەلایەوە زۆر قورس بوو، ڕێکەوتنەکە تازە مۆر کرابوو،

(ابو جندل) کوڕی سوهەیل کە لە مەککە موسوڵمان بووبوو بەند کرابوو سزا دەدرا،لەم کاتەدا کە زانی پێغەمبەر نزیک بووە، خۆی دەرباز کرد، کەلەبچەکەی هەر لەمەچەکدا بوو، کە سوهەیلی باوکی ئەوەی بینی،هات بۆی و،لێیدا و بردیەوە و ووتی ئەی محمد ئێمە ڕێکەوتوین و،ئەمەش دوای ڕێکەتنەکەیە.. پێغەمبەر فەرمووی (ڕاست دەکەیت).. موسوڵمانەکان زۆر خەفەت باربوون، بەڵام پێغەمبەر فەرمووی بە ابو جندل (خۆت بگرە و ئارام بە)، بە هاوڕێکانی فەرموو.. (خوا گرێیان بۆ ئاسان دەکات و فریایان دەکەوێت، ئەوەیشی لە ئیسلام هەڵگەڕێتەوە ئێمە نامانەوێ و خوا لەناوی بەرێ).. لە جێیەکی تردا دەفەرمووێ (بزانەکە خوای گەورە دەرووی خۆی لە تۆش و - ابا جندل - موسوڵمانە بێ دەسەلاتەکانی تریش دەکاتەوە و ڕزگارتان دەکات)....ئەبو (بصیر) بە نهێنی ڕوو لەشاری مەدینە دەکات، بت پەرستەکانیش دووکەس بەنامەوە دەنێرن هەتا بیهێنێتەوە، چونکە بەبێ پرس ڕای کردووە.

پێغەمبەر ئەبو بصیری بانگ کردوو فەرموی ( خۆت دەزانی ئێمە پەیمانمان مۆر کردووە، ناتوانین غەدر بکەین.. بگەڕێرەوە بۆ مەککە) سەحار دەڵێ (چار نیە هیوادارم خوا دەروتان لێ بکاتەوە) ابو بصیر گوێ ڕایەڵ بوو لەگەڵیان ڕۆشت .. موسوڵمانەکان زۆر نارەحەت بوون، دەگریان بۆ پاشە ڕۆژی ئەبو بصیر.. کە گەیشتنە ناوچەی (ذو الحليفة) ابو بصیر شتێک هات بە خەیاڵیدا،بە بت پەرستەکانی ووت (من ماندو بووم با دانیشین و نان بخۆین).. مامۆستا پارەزانی دەڵێ (بەکابرای عامری ووت کامەیە ئەم شمشێرەی تۆ.. بزانم تیژە..؟) بەهەر

فیلێ بوو لەدەستی وەرگرت.. بەرزی کردەوەو کوردانە (عامری)ە کەی پێکوشت.. ئەوی تریان بە هەناسە برکێ رایکرد بۆ مەدینە،ئەوەستا هەتا چوە مزگەوت، پێغەمبەر سەلات و سەلامی خوای لێبێ کە بینی (فەرموی ئائەوە ترساوە بزانن چیە؟) ئەوەندەیان نەزانی ابو بصیر وەک نەڕەشێر بەپەلە خۆی کرد بە ژوردا شمشێری خوێناوی بەدەستەوە،کە پێغەمبەر بینی فەرموی ( ویل امه، مسعر حرب لو کان معه رجال) یان (معه احد) ابن اسحاق دەڵێ (محش حرب) واتە (موقدها ومهجها)[39] واتە (دایک نەیبینێ.. ئەمە ئەگەر هاوڕێی هەبوایە جەنگی هەڵدەگیرسان..) وادیار بوو کارەکەی پێخۆش بوو..)[40]

ابو بصیر فەرموی (ئەی پێغەمبەری خوا تۆ پەیمانی خۆت جێبەجێ کردو منیش ئاینم ڕێم نادات کە توشی خراپەم بکەن و یاریم پێ بکەن..)

ابو بصیرسەرنجی دا کە نابێ لە مەدینە دانیشێ.. خۆ لە مەککەش نازێ، لەگەڵ (٥) کەسی تردا کە ئەو رۆژە لە مەککەوە رایان کردبوو، رۆشتن تا گەیشتنە جێیەک بەناوی (العیصی) لە قەراغ دەریاو لەسەر ڕێگای شام، پەیمان بوو کە محمدو قریش ئەو ڕێگەیە بپارێزن چونکە ڕێی ئازوقەیە.. ابو بصیر چوە سەر ئەو ڕێگەیەو هەرچی کاروانی قورەیش بهاتایە دەیکوشتن و تالانی دەکردن.. موسوڵمانانی مەککە پێیان زانی ، یەک و دوو هەڵهاتن بۆ لای.. پاشان (ابو جندل) یش هەڵ هات،هەتا ژمارەیان بوو بە حەفتا کەس، ابو بصیر بویە فەرماندەیان، قورەیش زۆر ترسان، بەتەنگەوە هاتن.. مقۆ مقۆ بوو کە شەوێک دەدەن بەسەر مەککەدا، بۆیە ناچار بوون بۆ لابردنی ئەو(بەندە) قسە بکەن،هەموو لە ( دار الندوه ) کۆبونەوە،بۆ ئەوەی بگەنە رایەک.. موسوڵمانەکان وتیان دەبێ سەرۆکەکەیان خۆی بێت و بەدەنگی خۆی بەیانەکە بخوێنێتەوە.. ( ابو سفیان ) خۆی رۆشتوو بەندی سێهەمی بەتکاو پاڕانەوەیەکی زۆر کوژاندەوە..[41]

بەدەنگی بەرز خۆی خوێندیەوە،پێغەمبەر نامەیەکی بۆ ابو بصیر نووسی و داوای لێ کرد (ئازاری کەس نەدەن، ئەو بەندەمان لابردوە، بۆ ابو بصیر هەیە لە هەرکوێ خۆی پێی خۆشە دابنیشێ..) نامە گەیشتە ابو بصیر کە لەکاتی نەخۆشیدا بوو.. نامەکەی خوێندەوەو خستیە سەر سنگیو گیانی پاکی بەو ئەشکەوتو چیا بەرزانەی حیجازەوە بەخوا سپارد.. ابو بصیر لە چیاکانی کوردستان لە دایک بوو، دوای ئەو هەموو تاو و توێیەی بیابان ئەوەتە لاشەی موبارەکی بە چیای حیجازەوە ئەسپەردە کرا.. لە چیاوە بۆچیا.. ( ابو جندل ) لاشەی فەرماندەکەی

شۆڕدو نوێژی کردو لەو چیایە بەخاکی سپارد ئێستە مزگەوتێکی لاکراوەو خەڵکی دەچن بۆ بینینی ئەو یادگارە.. ئەو سەرکردە کوردە:- أ- ئەو بەندەی لە ڕێکەوتن نامەکە هەڵوەشاندەوە..ب- بووە هۆی ئەوەی جوبرەئیل دابەزێو ئایەتی (وهو الذي كف ايديهم عنكم وايديكم عنهم ببطن مكة.. سورة الفتح- ٢٤).. کە بووە هۆی ڕزگاربوونی موسوڵمانەکانی مەککەو ئاو خواردنەوەی ئەوانەی مەدینە.. ئەم سەرکردە پارتیزانیە، ئەم هونەرە نوێیەی خستە ناو دانشگای جەنگی مەدینەوە.. هەروەک چۆن ( سەلمانی فارس ) پلانێکی فارسی لە جەنگی خەندقدا بۆ دانشگای جەنگی مەدینە تۆمار کرد.. کە بووە هۆی دابەزینی سورەتی ( الاحزاب )،ئەوەتە کوردێک نەخشەیەکی کوردی پارتیزانی تۆمار دەکاو دەبێتە هۆی دابەزینی چەند ئایەتێک لە سورەتی ( الفتح )ائەمە بوو چیرۆکی ئەبو بصیر، بێگومان باوک و کوڕو نوێنەرەکانی تر ڕۆڵی بەرچاویان بووە لە ١- خزمەتی ئیسلام و موسوڵمانان بە گێڕانەوەی حەدیس و هێنانی هونەری جەنگی.. ٢- لە ئاسان کردنی گەیاندنی ئیسلام بە بێ شەڕ بۆ کوردستان.. ٣- لە دروست کردنی ڕاپەڕینێکی گەورە لە شارەزوور و هاتنی سەرکردەی فارسی (پاو) بە دوو هەزار چەکدارەوە بۆ سەرکوت کردنیان، بەڵام نەچووە سەر.. ٤- هاتنی (پیروەت)ودوانزە سەرکردەی کورد بۆ پێشوازی سوپای ئیسلام.. ٥- هەڵهاتنی سەربازە کوردەکان لە خزمەتی سەربازی سوپای فارس..

موسوڵمانەکانیش سەر کردە کوردەکان ناگۆڕن، زانا و شارەزایان بۆ دەنێرن هەتا لە ئاینیان حاڵی بکەن.. مەعلوم نیە جابان و ماڵ و منداڵ و خێزانی (مەیمون) لەم کاتەدا نەگەڕابنەوە کوردستان وەک کادرێکی زانا و شارەزا کە خولی مەککە و مەدینەیان تەواو کردبێت.. من وای بۆدەچم ئەگەرکوردەکان ڕێکەوتنێکی نهێنیان لە مەدینە مۆر نەکردبێ و پەیمانێکیان دانەمەزراندبێ، چۆن ئەو هەموو سەرکەوتنە سیحراویە بۆ ئیسلام دێتە بەرهەم، کە هەموو میللەتانی ئەوکاتە لە کوردەکان ترساون و خۆیان لە کوردستان پاراستووە..

## هۆزی جاوان (گاوان)

وشەی جابان لەسەرچاوەکاندا بەم ناوانە هاتوون : جابان - کابان - گاوان - جاڤان -، ئایا جێیەک یا هۆزێک بەم ناوەوە لە کوردستاندا هەیە هەتا ڕەگ و ڕیشەی (جابان الكردى ) لەسەر دابمەزرێنین..؟

جمیل ڕۆژبەیانی دەڵێ (لەکۆڕێکی دکتۆر جەواددا بەشدار بووم، لەبارەی (جاوان) ەوە ساڵی (١٩٥٦) لە کۆڕی زانیاریی کورد، کە لێبویەوە پێی وتم: بیروڕات دەربارەی هەوار و مەڵبەندی کۆنی ئەم عێڵە چۆنە..؟ وتی : لات وانیە لە پێشا لە دەوروبەری (سیروان) و دەشتی (قەرەتەپە) دا نیشتەجێ بوبن..؟ لەوەرامدا وتم : (دکتۆر من تا ئێستە دەربارەی ئەم عێڵە وورد نەبومەتەوە) پاشان یەکمان بینیەوە، ووتم : (دکتۆر وام بۆ دەردەکەوێ کە ئەم عێڵە جاوانە لەمەوبەر لە (جەوان ڕۆ) نیشتەجێ بوبن و لەوێوە بەرەوخوار بوبنەوە..) دکتۆر قسەکانی منی پێخۆش بوو، پاشان وتی (ئەم باسە لێکۆڵینەوەیەکی قوڵتری دەوێ، تۆ لای خۆتەوە کتێبە فارسی و تورکیەکان بپشکنەو منیش هەوڵ و کۆششی خۆم ئەخەمە کار..) [42] دکتۆر مصطفى جواد دەڵێ (گاوان) هۆزێکی کۆنی کوردە، لە مێژووی عێراقدا لە هۆزە هەرە بەناوبانگەکانە و، لە هەموان زیاتر جێو ماوای بووە و لەبارەی شەڕ و شۆڕ و سیاسەت و هونەری شیعر نوسین و ئەدەبدا لە هەموان هونەرمەندتر بوون، بەڵام ئەوانەی لە مێژووی کوردیان کۆڵیوەتەوە، نەلێی تونێژیونەتەوە نە لێی وورد بونەتەوە، هەتا بەو کارە گەیشتوە کەلە مێژووی عێراقدا جێگەیان بۆ دیاری نەکراوە [43] مامۆستا ڕۆژ بەیانی دەڵێ (وام بۆ دەردەکەوێ کەیەکەم جار (جوان ڕۆ) مەڵبەند و جێنشینی گاوانیەکان بوبێت، لەوێوە بەرەو خوار بوبنەوە.. جاوانیەکان لەبەشی چیا ژیاون و لە نێوان زنجیرە چیای شاهۆ (زاگرۆس) و زنجیرە چیای هەڵە بەرز (البرز) و هەر لە حەلوانەوە تا لای سەرەوەی (ڕەی) بەپانی و هەر لە (اصفهان)ەوە تا نزیکی (ئازربایجان)ی خواروو بە درێژی ژیاون.. وادیارە بومەلەرزە و قات و قڕی، لەئەمیرەکانی (بوەیهی) کە لەسەدەکانی سێیەم و چوارەمی کۆچیدا پایتەختیان (ڕەی) بووە، زۆری بۆ هێنابن کۆچیان کردبێ.. وادیارە کە هاتونەتە خوارەوە دەوروبەری چیای شاهۆیان کردوەتە مەڵبەند و هەوار و ناونراوە (جوان ڕۆ) [44]

(ابن الاثیر) لە دەنگ وباسی ساڵی ٣٩٧ی کۆچی دا دەڵێ (عمید الجیوش) واتە سەرۆکی ئەرکانی سوپای بوەیهی، (ابو الفتح کوڕی عەنار) ی ناحەزی (بەدر) ی کردە پارێزگاری شاری خۆراسان..(بەدر)لەم کارە تورە بوو، ناردی (ابو جعفر حەجاجی) کۆنە سەرۆکی ئەرکانی بوەیهیەکانی لە کار لابراوی بانگ کردە لای خۆی و کۆمەڵێکی زۆری لە کوردان بۆ کۆکردەوە وەک (ئەمیری هیندی) و (ئەبو عیسای شادی) و (ئەمیر وەڕامی سەرۆکی جاوانیەکان)ڕەوانەی کردن بۆ گەمارۆ

دانی بەغداد بەهێزێکی (١٠) هەزار کەسیەوە، ئەم هێرشـە بـوە هـۆی ئـەوەی کـە هۆزی جاوان لە چیاکانەوە بـەرەو خـوار ببنـەوە بۆ پـێ دەشـتـەکان [45] دوویـارە نـاوی جـاوان دەباتـەوە و دەڵـێ (شـەڕ قـەوما لـە نێوان(ابـو الحسنی اسـدی) و کوڕەکـانی (دوبـەیس) دا، ئەسـەد یارمـەتی لـە (شـازنجان) و (جاوانیـەکان) وەرگرت، ئەمە بوە هۆی ئەوەی کـە هـۆزی جـاوان لـە هـەرێمی چیاکانـەوە بێنـە خوارەوە بۆ پێ دەشتەکان، لەسەدەی پێنجەمی کۆچیدا ناوبانگیـان دەرکـرد و دەسەلاتیان پەیدا کرد) (پاشان بەرەو خوار شۆڕ بوونەوە و لـە شـاخەکان هاتنـە خوارەوە بۆ شارەبان و دەسـکەرە و بەلـەدروز و مـەندەلی و کـوت و دەوروبـەری بەغداد و خوارتریش، هەتا لە ساڵی ٤٩٧ی کۆچیدا لەگەڵ ئەسەدییە عەرەبەکان شاری حیللـەیان دروسـت کـرد..) مامۆسـتا هـەژار موکریـانی دەڵـێ (گاوانیـەکان شافعی مەزهەب بوون)[46] (عیمادی ئەسفەهانی) لە چەرخی شەشەمی کۆچـیدا باسی ئەم هۆزە دەکا و ناوی هەندێ لە فـەرمانڕەوایانی دەبـات وەک (ئـەمیر ابـو شوجاع) ی کورد، کە لەگەورە پیاوانی کوردی گاوانە)[47] (فەیرۆز ئابادی) دەڵـێ (گاوان هۆزێکی کوردە و لە شاری حیللەی عێراق نیشتەجێ بـوون و زانـای ئـاینی وەک (محمدی کوڕی عەلی گاوان) ی لەوانە.. وە لەشاری حیلله گـەڕەکێک هەیـە هەتا ئەمڕۆش بەناوی (حی الاکراد) ناسراوە.. شاری حیللـە لـە کۆتـایی چـەرخی پێنجەمی کۆچیدا لەلایەن هۆزی گاوانیەوە دروست کراوە و کردویانەتە پایتەختی خۆیان.. هێرشی مەغۆلەکان دەشکێنن)[48] (ابن بطوطة) لە گەشتەکەیدا سـەر لـە شـاری حیللـە دەدا و زۆر بـەجوانی باسـی ئـەو کوردانـە دەکـات کـە لـەو شـارەدا دەژین.. مەبەست لە هێنانـەوەی ئـەم مێـژوو نـوس و سـەرچاوانە هەوڵدانێکە بـۆ دۆزینـەوەی ڕەگ و ڕیشـەو بنەچـەی (جابـانی کـوردی) و شـوێنی دەرچـون وگەڕانـەوەی لـە مەککـەو مەدینـە..تـا ئێرە هۆزەکـەیمان دۆزیـەوە.. پێشـتریش گەڕانەوەکـەیمان دۆزیـەوە کـە (ابـو یحیـی) مـەهدی کـوڕی مـەیمون زانـای فەرمودەکان بووەو ساڵی ١٧٢ ی کۆچـی لـە کوردسـتان مـردووە.. هـەر کـارێکی بچوک و گەورە بۆ دۆزینەوەی ئەو مەبەستە - وەک دکتۆر مصطفی جـواد ووتـی- هـەوڵێکی دڵسۆزانەیە بـۆ مێـژووی کـورد.. چونکـە بوونـی کابـانی کـوردی لــە سەرەتای وەحیەوە لە شاری مەککە، نهێنیەکی گرنـگ ڕون دەکاتـەوە بـۆ مێـژوی ڕابونی ئیسلامی کوردی..

دکتور جواد دەڵێ (جاوانیەکان یەکەم جار لە دەوروبەری ڕوباری سیروان و قەرەتەپەدا نیشتەجێ بوون) ئەمین زەکی یەکێ جار ناوی بردوون، ئەویش بە (جەوانی)[49] لە (مروج الذهب) مەسعودی ناوی هێناون بەلام بە (حاوان) بە بێ نوختە..[50] لە (قاموس المحيط) دا لە پیتەکانی - ج-ن-و- دا ناوی هێناون.
مێژوونوسان دەڵێن ناوی (گاوانیەکان) بە کۆتایی دەوڵەتی عەباسی، لەسەر ساحەی سیاسیو سەربازی نەماو (ون بوون)، ئەم کوردانە بەرامبەر مەغۆلەکان پاڵەوانی زۆر دەنوێنن و پارێزگاریەکی کەم وێنە دەکەن لە موسوڵمانان
تەنانەت (مانگۆخان) ئیمپراتۆری مەغۆلەکان نامەیەکێ بۆ هۆلاکۆی برای دەنوسیێو دەڵێ (کە لە هێزو دەسەلاتی ئازای لوڕو برا کوردەکانیان خۆتان بپارێزن.)..
ئەو کاتە لوڕو جاف سنوریان بەیەکەوە دەبێ، لە کۆندا بە جافیان دەوت (کورد) بە کۆچی جافەکانیان وتووە (کۆچی کوردەکان)..
لەدوای مەرگی (مستنصر با لله)، حوسامەدینی گاوانی سەرۆکی گاوانیەکان.. یەکێکێ بوو لەو ئەمیرە گەورانە کە بانگێ کرانە بنکەی خەلیفایەتی، بۆ ئەوەی کاروباری دەوڵەت ڕێکێ بخەن وە پلان و ڕێو شوێن دابنێن.. بەو جۆرە ژیا هەتا ساڵی (٦٤١) کۆچیامرد.. ئەم پیاوە سەرۆکایەتی شاری حیللەو ناوچەکەی دەکرد، دوای ئەم کوڕەکەی (عمادالدين) جێی گرتەوە، هەتا ساڵی (٦٥٦)ی کۆچی، عمادالدين کە سەرکردەیەکی گەورەبوو لە سوپای عەباسی دا، لە گەڵ (هۆلاکۆ) و مەغۆلەکان جەنگا، هەتا لە شەڕێکی نەبەردانەدا شەهید کرا..[51]
لێرەدا خەلافەتی عەباسی فەوتا.. گاوانیەکانیش دوای نەمانی سەرکردەکەیان پاشەکشەیان کردو گەڕانەوە کوردستان و جێی ئەسڵی خۆیان لە شارەزورو جوانڕۆ و قەراغ ئاوی سیروان و خۆیان بە مەڕ و ماڵاتەوە خەریکێ کرد..
لەو کاتەوە گاوان و جاوان بویە جافان.. ئەمانە لەسەردەمی عوسمانیەکاندا سەریان هەڵدایەوە و دەوریان لە ناوچەی خۆیاندا هەبوو ماموستا هەژارو دکتور جەواد تێدەکەون لەو بۆچونەیاندا کە دەڵێن:
مامۆستا هەژار دەڵێ (ئەم هۆزە لە کۆنا هەبوون، بەلام ئێستە نەماون..)
دکتور مصطفى جواديش دەکەوێتە هەڵەیەکی مێژوییەوە کاتێ دەڵێ دوای هێرشی هۆلاکۆ و مەغۆلیەکان و ڕوخاندنی دەوڵەتی عەباسی، جاوانیەکان بوون بە عەرەب

و تێکەڵ بە عەرەبەکانی فوراتـی نـاوەند بـوون..

ئێمە ئـەمڕۆ بـاوەڕ بـەوە ناکـەین گـەلێک لـە نـاو بـبرێت و ئاسـەواری نـەهێڵدرێت نەخوازەلا بتاوێتەوە و زمان و ڕەگەزیان نەمێنێ.
بـەڵکو جاوانیـەکان دوای گرتنـی بغـداد چـەند جـارێک پێکـەوە لەگـەڵ هـۆزە عەرەبـەکاندا هێزەکانیـان یـەک پێدەگـرن و لـە چـەند شـەڕێکی قارەمانانـەدا مەغۆلەکان دەشکێنن، بەلام لەبەر زۆری مـەغۆل و دڕندەیـی سـەربازەکانیان، ئـەو وەحشی گەریەی کەبەسەر بغدایان هێنا، هۆزی جاوانی ناچار دەبێـت دەشـتەکانی ڕۆژهـەلات و خـواروی بغـداد و حیللـە بـەجێ بهێڵـن و بـەرەو چیـاو مەڵبـەندە ئەسڵەکەی خۆیان بگەڕێنەوە و خۆیانی تیـا قـایم بکـەن،کـە ناوچـەی جـوان ڕۆ و شاخەکانی هەورامانی ئەمڕۆ دەگێڕێتەوە.. بەم گەڕانەوەیە و لەم ڕەوە گەورەیەدا پەیوەندی جاوانیەکان بە عەرەب و دەوروبەریانەوە کز دەبێت ئەو مـاوە زۆرە تـا ئـەمڕۆ نـاوی (جـاوان) یـان (گـاوان) بـەو نـاوەوە سـڕاونەتەوە، پاشـان بـەناوی (جاف) ەوە هەڵسوکەوت و جموجۆڵیان دەبێـت و دەژیـن و دێنەوە سـاحەی مـل ملانێ..
مامۆستا ڕۆژ بەیانی دەڵێت (جاوانەکان لـە بنـەڕەتدا شـێوەی زمانیـان کرمـانجی ژوورو بوەو بە خۆیان وتوە (جاڤان)، کە چونەتە حیللە و دەوروبەری خوێندەوار و نووسەرەکانیان کەزانیویانە لە فارسـی و عـەرەبیدا پیتـی (ڤ) نی‌یـە، هـەر وەک شێوە فارسی‌یەکە ناوەکەیان بە (جاوان) یاداش کردوە، بەلام جەماوەری عێڵەکە تێکەڵ بە عەرەبی (ئەسەد) بوون لە حیللە، عەرەبـەکان پێیـان وتـون (جافـان)، عەرەبەکان وایان زانیوە ئەم ناوە دووەکی‌یەو بۆ دوو عێڵ بەکارهێنراوە، پاشان کەزانیویانـە ناوەکـە دووەکـی نی‌یـە و یەکەبی‌یـە، پێیـان وتـون (جـاف) و کوردەکانیش پێی ڕاهاتوون.. یان دەڵێ.. وشەی (جاف) کە بووە بەناو بۆ ئـەم عێڵە کوردە گەورەیە تا دەورانی عوسمانی و سەفەوی واتە سەدەی (یانزەهـەمی زاین) لە هیچ مێژوویەکدا بەر چاو نەکەوتوە، ئەی لە پڕ لـە کوێوەبـاری ؟بێگومـان هەر ئەو جاوانەی کە گەڕانەوە وولات و ناوی جافیان پـەیدا کـردووە لەسـەردەمی ئەم دوو دەوڵەتەدا بوون بە دوو بەشەوە ئەمەیان کەهەر بە (جوان ڕۆ)ماوەتـەوە بە (جافی جوان ڕۆ) ناوی دەرکردووە، ئەو بەشەیان کە هاتۆتە خوارەوە بۆخاکی کوردستانی ئەم دیوو ناوی خۆی ناوە (جافی مورادی). بەلام مامۆستا ڕۆژ بەیانی

بلیمەت نازانم بۆچی بەسادەیی دەڵێت (ئەوانەش کە زۆر سادەیانە ناوی (جاوان) یان بردۆتەوە سەر (گاوان) بە ڕاستی جێی سەرسوڕمانە..) چونکە هەر خۆی باسی دابەزینی جاوانیەکان دەکات بۆ ناو دەشتە عەرەبەکان و ئەوان (گ) دەکەنە (جـ) کەواتە (گاوان) بوەتە (جاوان) ئەم بۆچونەش هەر نزیکە و (گاوانی کوردی) کە عەرەب پێی دەڵێن (جابان الکردی) هەر لەم عێڵەن و وەک خۆی دەڵێ (هەروا (جابان) ی باوکی (مەءمون) کە یەکێ بووە لە یارانی پێغەمبەری ئیسلام لە بنەڕەتدا لەم تیرە بوون..) بەم جۆرە ئەم (جاف) انەی ئەمڕۆ کە بریتین لە دەیان هۆز و تیرە و زۆر ناوچەیان لە کوردستانی عێرا ق و ئێران گرتۆتەوە، هەر ئەو (جاوانە) یان (گاوانە) کۆنانەن، (جاف)بووە بە ناوی ڕەسمی بۆ ئەم هۆز و تیرە کوردانە و لە دەوڵەتی عوسمانیدا هەر بەم ناوەوە ڕەسمیەتیان وەرگرتووە و خاوەنی دەسەلاتی خۆیان بوون.. یەکێک لە هۆزەکانی جاف (میکائیلیە) کە بەناوی ئەولیایەکە وە ناونراوە کە ناوی (پیر میکائیل) بووە، لەساڵی (٧٣٨)ک کۆچی کردووە بۆ ناوچەی جوان ڕۆ لە دێی (دەوان) دانیشتووە بۆ ڕێنمویی موسوڵمانان وە هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە..[52]

یەکێکی تر لە ناودارەکانی هۆزی جاف (مەولانا خالید) نەقشبەندیە لە هۆزی ئاڵبەگی میکائیلە، بەدوای وریاکردنەوەی میللەتەکەیدا دەگەڕێو بۆ ئەو مەبەستە ساڵی (١٢٢٠) ی کۆچی دەگاتە مەککەو بۆ هونەری بانگەواز ڕێگای دوری هیندستان دەگرێتە بەرو سنەو هەمەدان و تاران و مەشهەدو هیرات و کابول و قەندەهارو پیشاوەر و دەهلی دەبڕێو دەگاتە جیهان ئاباد بۆ خزمەتی شاه عبدا لله ی دەهلەوی، ئەو زانایەش پێنج شێوازی هونەری بانگەوازی فێر دەکاو ئیجازەی دەداتێو دەینێرێتەوە بۆ کۆکردنەوەی زانایانی کوردستان و ناوچەکە، ئەم پیاوە دەورێکی گرنگ دەبینێ لە وریاکردنەوەی خەڵکی کوردستان و ناوچەکە. مەحمود پاشا لە سلێمانی ڕێزی دەگرێو خانەقای مەولانا خالیدی بۆ دەکاتەوە.

بەگزادە جافەکان هەتا ساڵی (١٧١٨) زاینی هەر خاوەنی ئەم دەسەلاتە بوون بەسەر ناوچەو هێز و هۆزوو تیرەکانی خۆیاندا.. تەنها بەناو لە سایەی فەرمان ڕەوایی میرە ئەردەلانیەکاندا بوون، ئەم سەربەخۆیی و مل نەدانەیان بە دەسەلاتی ئەردەلانی بوو بەهۆی ناکۆکی و دوژمنایەتی، لە ئەنجامدا جەنگێکی ناهەموار لە نێوانیاندا هەڵگیرسا، ئەردەلانیەکان توانیان هێزێکی چاک پێک بهێنن و هێرش

بکەنە سەر جافەکان، لە ئەنجامی ئەم جەنگەدا سەرۆکی جافەکان کوژرا، دوایی کوڕ و براکەشیان گرت و بە خنکاندن کوشتیان، ئەم ڕوداوە بوو بەهۆی کۆچ کردن و ڕەو کردنی ژمارەیەکی زۆر لەسەرۆک و خێزانەکانی هۆزی جاف لە ناوچەی جوان ڕۆوە پەنایان برد بۆ لای میرەکانی (بابان) لە قەڵاچوالان..

دەرکەوتنی مێژووی هۆزی جاف لە شارەزووردا لەو کاتەوە دەست پێ دەکات کە (زاهیر بەگ) ر زیاتر لە سەد ڕەشماڵی جاف لە ناوچەی جوان ڕۆوە کۆچ دەکەن بۆ ناوچەی (بانی خێڵان) کە ئەکەوێتە قەراغی ڕۆژئاوای ڕوباری سیروان، ئەمەش لەسەردەمی (ئەحمەد پاشای بابان) دا بووە لە قەڵاچوالان، پاشان (زاهیر بەگ) بە خۆی و (٣٩) کەسەوە لە دەست و پێوەندەکانی لەسەفەرێکدا لە شارەزووردا بەدەست تاقمە چەتەیەکەوە کوژران و هەر لەوێدا نێژراون کە ئێستە بە (گۆڕی کوڕ گەل) بە ناوبانگە و لە بانی خێڵانەوە زۆر نزیکە، پاشان کە بۆ پاشای بابان دەردەکەوێ کە زاهیر بەگ بەبێ تاوان کوژراوە و لەوتاوانانەی کە بۆیان ڕێک خستبوو بە دوور و بەرییە، دڵ نەوایی (قادر بەگی کوڕی زاهیر بەگ) دەداتەوە و ناوچەی (دزڵیش) دەبەخشێتە قادر بەگی کوڕی. بەم بەخشینە ژمارەیەکی زۆر لە جافەکان کۆچ دەکەن بۆ ئەو ناوچەیە لە شارەزوور و هەڵەبجە و هەوراماندا و هەتا ئەم دوایەیەش هەر جاف مورادی بنەماڵەی فەرمانڕەوا و سەرۆکایەتی جافیان کردووە، کە لەلایەن بابانەکان و عوسمانیەکانیشەوە ناسراون و سنوری ناوچەکەیان یەکجار فراوان بوو.. بەم جۆرە هەر لە باخ و باخات و زەویەکانی قزڕەبات و خانەقینەوە دەسەڵاتیان بووە هەتا دەگاتە ناوچەی پێنجوین و سنوری ئێران لەسەرەوە،کە ناوچەی ئەم تیرانە دەگرنەوە و جافی موڕادی پێک دەهێنن. کەئەمە (٤٤) هۆز و تیرەیانە (مکایەلی - گەلالی - رۆغزایی - هارونی - شاتری - تەرخانی - یەزدان بەخشی - کەماڵەیی - نەورۆلی - باشکی - تیلەکۆ - سەدانی - عەمەلە - تاوگۆزی - بەداخی - یاروەیسی - شێخ سمایلی - عیسایی - سۆفی وەن - بێسەری - سایل عوزەیری - یۆسوجانی - پشت ماڵە - جافی کەلان - زەردۆیی - ئاغاسوری) هەندێکیش لەبەر زۆرداری میرەکانی ئەردەلان کۆچیان کرد بۆ ناو تیرە و هۆزەکانی گۆران وەک هۆزی (قادر میر وەیسی) - تایشەیی - قەڵخان جاکی - یوسف یار ئەحمەدی - کۆیک - نیرجی - کرکایشی) بەلام بەشی سێیەم لە جافەکان بە پەرتەوازەیی بە دڵ شکاوی لە جێی خۆیان مانەوە لە ناوچەی جوان ڕۆ وەک (قوبادی - باوەجانی -

وەڵەدبەگی - ئێنناخی - ئیمامی - داڕواشی - دیلاتیجی - دێتیری - نامداربەگی - میرەبەگی - دڵەتازەیی ) بە تێپەڕ بوونی ڕۆژگار جافی مورادی یان بەگزادەکانی جاف بوون بە خاوەنی تاپۆی زۆری ئەو ناوچە گەورەیە و سەرپەرشتی هۆزەکانیان دەکرد هەتا گەیشتە سەردەمی ( محمد پاشا ) کە ئەو مرد دەسەڵات کەوتە دەستی کوڕەکانی ( وەسمان پاشا، محمود پاشا، محمد علی بەگ ) ئەم کوڕانە دوای کۆچ کردنی باوکیان ناوچەکەیان لەنێوان خۆیاندا بەش کرد وەک ( وەسمان پاشا ) ناوچەی هەڵەبجە و خورماڵ و شارەزووری کەوتە دەست، ( محمود پاشا ) دەسەڵاتی کاروباری هۆز و تیرەکانی جافی گرتە دەست و لەکاتی وەرزەکانی بەهار و پایزدا بۆ گەرمیان و کوێستان لە کاتی کۆچەریاندا لەگەڵیان دەڕۆشت، ( محمد علی بەگ ) ئەمیش زەوی و باخ وباخاتەکانی ناوچەی قزڕەباتی وەرگرت.. بە تەنها سوارەکانی ئەم سێ برایە لە چوار هەزار چەکدار بە تفەنگی مارتینی چەک دار کرابوو زیاتر بوون، ئەمە هەمووی بەرامبەر باج و خەراجێکی کەم کەدەیاندا بە حکومەتی تورک، کاتێک وەسمان پاشا نیازی بوو ژنێک لە میرەکانی ئەردەڵان بخوازێ تورکەکان ناڕازی بوون، بۆ ئەوەی بتوانن پەیوەندی وەسمان پاشا هەر بەخۆیانەوە بەند بێت، تەنانەت ژنی یەکەمی وەسمان پاشا لەلایەن تورکەکان خۆیانەوە دەست نیشان کرا بوو، چونکە تیرەکانی ئەردەڵان سەر بە فارسەکان بوون و ئەندامێک بوون لە ئەنجومەنی وەزیران لە تاران.. ماڵە جافەکانی مرادی ئەو کاتە لە ( ١٠ ) هەزار ماڵ زیاتر بوون، بە کۆچ و بارەوە خەریک بوون کە زیاتر لە ( ١٤٠ ) میلیان دەبڕی و ژمارەی ڕانە مەڕەکانیان ساڵی ( ١٩٢٢ ) زیاتر لە ( ١٢٥ ) هەزار سەر دەبوو، دەوڵەمەندەکانیان چەندەها دێهاتیان لەملاولا کڕی بوو تیا نیشتەجێ بوبون، ژمارەی مەڕەکانی جاف چەند قات لەو ژمارە ڕەسمی‌یە زیاتر بوو چونکە لە کاتی سەرژمێری‌دا لەلایەن زەفتی‌یەکانی عوسمانی‌یەوە لە دۆڵ و ئەشکەوتەکان دەیان شاردنەوە بۆ ئەوەی باج و خەراجی نەدەن، دوا سەرۆکی هۆزی جاف کە دەسەڵاتی تەواوی بەسەر هەموو تیرەکاندا هەبوو ( محمد پاشا ) بوو، دوای مردنی ( محمودپاشای ) کوڕی بوو بەسەرۆکیان، بەڵام ئەم پیاوە وازی لە سەرۆکایەتی جاف هێنا بەرامبەر هەندێ تەماعی خۆی، هەر بۆیە کەوتە بەر لۆمە وتانەی بەگزادەکان لە ساڵی ( ١٩٤٠ ) دا ئەمیش کۆچی دوای کرد[53]، ئیتر جاف پەرتەوازە بوون و یەکیەتی و هاوکاریان نەما.. لە کوردەواری‌دا جافەکان بە کوردی ڕەگەز ورەچەڵەک ساغ و

پوخت و ڕەسەن دادەنران، چونکە گرنگترین و گەورەترین هۆزن لە کوردستانی خواروودا، ئەوسا بە جاف دەوترا کورد، بەوشەی کورد لە هۆزەکانی تر جیادەکرانەوە، ئەوسا بە کۆچی جافەکانیان دەوت کۆچی کوردەکان، بە زۆری جافەکان بەهۆی جم وجوڵ و هاتوچۆیانەوە لەسەرەتای سەدەی هەڤدەهەمدا هۆی دووبەرەکی و ناکۆکی بوون لە نێوان هەردوو ئە مپراطوریە تی عوسمانی و ئێراندا.. (مێجەرسۆن) یاداشت نامەیەکی گەورەی هەیە لەبارەی سەفەر و هاتوچۆکانی بە کوردستاندا.. (ئەدمۆنس) دەڵێ خۆشترین لاپەڕەکانی کتێبەکەی (سۆن) باسی ئەو ڕۆژانەیەتی کەلە هەڵەبجە بووە.. باسێکی خۆشی پەیوەندی خۆی دەکات لەگەڵ سەرەک هۆز و ناودارانی جافدا لە هەڵەبجە،کە ئەو کاتە ئەم شارە پایتەختی ئەوان بووە، (سۆن) لە هەڵەبجە چوەتەماڵی تاهێر بەگی کوڕی (عادیلە خانم) ئەو کاتە (سۆن) جاسوس بووە، بەڵام خۆی پێشکەش کردووە کە نوسەرو بازرگانێکی ئێرانی‌یە و خەڵکی شیرازە، تاهێر بەگ شاعیر بوو، کوڕی وەسمان پاشای محمد پاشای جاف بووە، بە چوار زمان هۆنراوەی هەیە، (مێجەرسۆن) (١٥) ساڵ پێش جەنگی جیهانی یەکەم هاتە کوردستانی عێراق، شەش حەوت مانگ لە ماڵی تاهێر بەگدا ماوەتەوە، خۆی ناو نابوو (غولام حسێن شیرازی) خزمەت کاری تایەر بەگی دەکرد، تایەر بەگیش خۆشی دەویست بەلام دەیزانی کەڕەوشتی ئەم لە خزمەتکارەکانی تر جیاوازە، چونکە شتێکی لەژێر سەردا بووە، خۆی زۆر بەهێمن و ژیر و بەئەدەب نیشان داوە، تاهێر بەگ لە ئەنجامی شێوازی قسەکردنەوە،بۆی دەردەکەوێت کەئەم پیاوە ئێرانی نی‌یە و ئینگلیزە،بۆیە پاش وتووێژێک پێ‌ی دەردەخات داوای لێ‌دەکات هەڵەبجە بەجێ‌بهێڵێت دەنا دەیکوژن.. مێجەرسۆن لەهەڵەبجە دەرچوو، ئەنجا یاداشتێکی نوسی « زۆر باسی ئەم خێزانە جافە بەگزادە و پاشایە دەکات » ڕاستی زۆری تیا وتوە، بەلام کاری خۆشی ئەنجام داوە.. سۆن تورکیا و ئێران و عێراق گەڕاوە،لە ئەستەنبوڵ توشی شێخ الاسلامی سنە دەبێت، ئەو لە ڕەگەزی سۆن حاڵی دەبێت، ئەو کاتە کە تایەر بەگ پێ‌ی زانیوە،شێخ الاسلامیش دێت بۆ بیارە، سۆن دەترسێ کەئەو بێتەوە نهێنی سۆن ئاشکرا بکات،بۆیە خێرا بۆی دەردەچێت و دەگاتە سلێمانی، شێخ الاسلامیش دەگاتە هەڵەبجە و ماڵی عادیلە خانم « توڕە دەبێ کە چۆن کافرێکی جاسوسی وەک سۆن بە درۆ خۆی کردوە بە موسوڵمان، لەناو کۆمەڵی ئیسلامدا جێ‌ی بۆتەوە؟ هەرچەند عادیلە خانم دەڵێ نەخێر ئەو

ئێرانی‌یەو بە چاوی خۆمـان دیومانـە نوێـژی کـردوە، سـۆن زۆر پـەیوەندی بـەهێز دەبێـت بـە عادیلـە خانمـەوە، دەبێتـە مامۆستای دوو کوڕەکـەی عادیلـە خـانم و فارسیان فـێر دەکـات، سـۆن زۆر بـەوردی باسـی کۆشـک وتـەلار و ژیـانی مـاڵی وەسمان پاشـا و عادیلـە خـانم دەکـات لـە شـاری هەڵەبجـەدا، پـەیوەندی تونـدی بەتایەر بەگەوە هەبووە، لەبەر ئەوەی کە وەسمان پاشا بە زۆری بـانگ دەکـرا بـۆ موسـڵ و کـەرکوک و سـلێمانی، عادیلـە خـانم وردەوردە دەسـەڵاتی حوکمـی وەردەگرت و حوکمی ناوچەکەی دەکرد، زۆر کـاری بـەجێی لەشـاری هەڵەبجـە و دەوروبـەری دا ئـەنجام دا، وەسمـان پاشـاش لـەم بـارەوە ڕێـی لـێ نـەدەگرت، بەندیخانە و دادگایەک و قەیسەریەکی گەورە ودوو کۆشکی گەورە لەسەر شـێوەی سنە لەشـاری هەڵەبجـەدا دروسـت کـرد و وەسـتای تایبـەتی لـە ئێرانـەوە هێنـا، کاروباری شارەوانی بەجێ دەهێنا.. تورکەکان ئەم کارەیـان زۆر پێ‌نـاخۆش بـوو، تورک ناچار هێڵی تەلـەفۆن و بروسکەیان گـەیاندە هەڵەبجە/بۆ ئـەوەی ئاگایـان هەبێ و/پەیوەندیان بە وەسمان پاشاوە توند بێت، بەڵام جافەکان ئەو خەتانـەیان دەپچڕاند و حـەزیان نـەدەکرد دەسـتی تورکیـان لێـوە نزیـک بێـت، عادیلـە خـانم هاوینە هەواری لـە دێکـانی هـەورامان و ئـەو دیـوو هـەبوو، لـەم دوورەوە دەسـتی تورکیان دەگەشتێ، ئەم ئافرەتە توانی قەڵەم ڕەوی دەسەڵاتی خۆی بپارێزێت کە سۆن لە باسیدا دەڵێت : ( بەڕاستی لە نـاو کۆمـەڵی ئیسـلامدا ئـافرەتی وەهـا بـێ چەشن و بێ وێنەم کەم دیوە، بەدەگمەن ئافرەتی وا خاوەن دیـوانو دەسـەڵاتدار و شارەزای چەک هەڵدەکەوێ، هۆزی جاف هۆزێکـی خـاوەن مێـژووە و ڕەگـەزدارە، هـەر لەسـەرەتای مێـژووی کوردسـتانەوە بـە یەکیـەتی و پتـەوی هاوکـاری سەرۆکەکانیان ناوبانگیان دەرکردووە، کـە ئـەم یەکیـەتی و یەکگرتنـە بەدەگمـەن لەناو گەورەکانی کوردا بەدی دەکرا ). عادیلـە خـانم سـاڵی ١٨٥٩ لـە دایـک بـووە، ساڵی ( ١٩٠٩ ) دوای مردنی وەسمان پاشا سەرۆکایەتی هـۆزی جـافی خسـتە ژێـر دەستی خۆی، لەساڵی ( ١٩٢٤ ) دا وەفاتی کرد[54] و لە دێی عەبابەیلێ نێژرا.. لە جـەنگی جیهـانی یەکـەمدا و بەدەسـتی بریتانیـا/سـاڵی ( ١٩١٩ ) دەسـەڵاتی ئـەم جافانە نەماو هەتا ئێستە بەگزادەکانیان هەر یەکە لە جێیەک سەرگەردان و دوور لە ناز و بێ دەسەڵاتن.[55] .. بەلای منەوە سەرەتاو کۆتـایی ( جابـانی کـوردی ) و هۆزی گاوان و تیرەی جاف یەک زنجیرەن و بەم جۆرە هاتوە، بەردەوام دەسەڵات و سیاسەت وسوپایان لە مێژووی کـوردو ناوچەکـەدا بـووە هـەتا جـەنگی جیهـانی

یەکەم کە ئیتر بێ پەناو سەرۆک و سەرکردە مانەوەو پەرتەوازە بوون.. ئێستە وێڵی کەسێک و دڵسۆزێکن کۆیان کاتەوەو ئەو دەورە مێژوویی‌یەیان پێ ببینێتەوە..



٥٠- مروج الذهب- المسعودي- ج٣ ص[٢٥٤] طبع اوروبي

٥١- هەژار- هۆزی لەبیرکراوی گاوان- ل١٠٢

٥٢- مدرس. مەلا عبدالكريم- یادی مەردان- ب ١ ل ٧ بغداد ١٩٧٩

٥٣- حسن. محمود عزیز- کورتەیەك لە مێژووی جاف- لـ ٥٨ سلێمانی ١٩٨٥

٥٤- سۆن. مێجەر- رحلة متنكر الى بلاد ما بين النهرين وكردستان- ترجمة فؤاد جميل- ص[٢٣٥ - ٢٥٠]

٥٥- حەمە کەریم. حسن محمود- هەڵەبجە لە کۆن و نوێدا- بەشی دووەم - یەکگرتو- ٨٤ /١٩٩٦

# کتابخانەی کوردی

کۆمپیوتەری ژیر

شەقامی مەولەوی - بازاڕی سۆز - نزیک بەرید

# نــاوەڕۆك




ژمارەی سپاردن (٢٥) ی بەرواری ١٩٩٧/٧/٨/٢٠٠

وەزارەتی ڕۆشنبیری

هەرێمی كوردستانی عێراق

کوردەکان بەپێی خۆیان چوون بەدەم ئیسلامەوە، بۆیان نەهێنان.. هەر بۆیە بەهاتنی سوپای ئیسلام جەنگێکی وای شایانی باس لە کوردستاندا ڕووی نەداوە.. جیاوازی زۆرە لەنێوان کەسێک بۆی بەری و، کەسێکی دی خۆی بچێ بەدەمیەوە، کوردەکان لە چونەکانیاندا بەتەواوی قەناعەت و ئارەزووی دڵ و باوەڕ و دڵسۆزیەوە بوو، نەک وەک نوێنەری عەرەبەکانی جزیرە..

نەمدیوە لە مێژووی هیچ میللەتێکدا، لەهەموو لایەکەوە بەم قەڕەباڵغیە سەریان لە پێغەمبەر دابێ و ئیسلام بوونی خۆیان ڕاگەیاند بێ.. ئەگەر ئەمە مانا لە شتێک بدات، هەر ئەوە دەسەلمێنێ کە کورد خاوەنی فطرەی پاک و ڕەوشتی بەرز بوون، بەدوای ڕاستیدا گەڕاون.. لە کاتێکدا کەمیللەتانی تر بەزۆر بێ یان بە خۆشی ئیسلامیان بۆ براوە.. بەڵام کورد بەزەین و پێی خۆی بەدوایدا گەڕاوە و پەیدای کردوە.

ژمارەی سپاردن (٢٥) ی بەرواری ٨/٧/١٩٩٧/٢٠٠

وەزارەتی ڕۆشنبیری